# فرض طلب العلم

تأْلِيف

أبِي بَكرٍ مُحمَّدِ بنِ الحُسَيْنِ بنِ عبدِاللهِ الآجُرِّي

# كتێبی

فرض طلب العلم لإمام الآجرى به كـوردى



٢٩/ربيع الأول/١٤٤٣

كتاب

# فرض طلب العلم

لإمام أهل السنة والجماعة أبي بكر محمد بن الحسين بن عبدالله الآجري (٣٦٠ هـ)

ناوی کتێب : فرض طلب العلم.

ژمارەی لاپەڕە : ١١٥

بەروار : ٢٩ / ربيع الأول / ١٤٤٣

# بسم الله الرحمن الرحيم

وبالله التوفيق

كورتەيەك لە ژیانی ئەم ئیمامە بەڕێزە :

ناوی محمد ی کوڕی حسين ی کوڕی عبدالله، أبو بكر البغدادي ە، ٣٦٠ هـ وەفاتی کردووە .

## مامۆستاکانی :

1. إبراهيم بن موسى، ابو اسحاق الجوزي التوزي (٣٠٣هـ) .
2. احمد بن الحسن بن عبدالجبار، ابو عبدالله الصوفي البغدادي (٣٠٦هـ) .
3. جعفر بن محمد بن الحسن، ابو بكر الفريابي (٣٠١هـ) .
4. عبدالله بن العباس، ابو محمد الطيالسي (٣٠٨هـ) .

## قوتابیەکانی :

1. احمد بن عبدالله، أبو نعيم الأصبهاني (٤٣٠هـ)، خاوەنی ﴿ حلية الأولياء ﴾ .
2. خلف بن القاسم بن سهل بن الدّباغ، أبو القاسم الأزدي الأندلسي القرطبي (٣٩٣هـ) .

3. علي بن محمد بن عبدالله بن بشران، أبو الحسن الأموي مولاهم البغدادي ( ٤١٥هـ).

١. اخبرنا [الشيخ أبو عبد الله محمد بن حمد بن حامد بن مفرج بن غياث الإرتاحي .. قال : أخبرنا أبو الحسن علي بن الحسين بن عمر الموصلي الفراء ] إذنا ، قال : أنا أبو زكريا عبد الرحيم بن أحمد بن نصر البخاري قراءة عليه . . سنة . . وخمس وأربعمائة ، قال : نا أبو بكر عتيق بن إبراهيم بن سعد الأنصاري بالقيروان في سنة [ بضع عشرة وأربعمائة ، قال : أنا محمد بن الحسين الآجري بمكة ، قال : الحمد لله المتفضل علينا بالنّعم القديمة ، والأيادي الجميلة ، حمد من يعلم أن مولاه الكريم يحب الحمد ، فله الحمد على النعم التي لا تُحصى ، وكيف تُحصى ، وقد قال جل ذكره : « وإن تعدوا نعمت الله لا تحصوها » [ إبراهيم : 34 ] . وأسأله الزيادة بفضله ، والمعونة على شكره ، إنه ذو فضل عظيم . وصلى الله على البشير النذير ، السراج المنير ، سيد الأولين ، ذاك محمد رسول رب العالمين ﷺ ، وعلى آله الطيبين وأصحابه المنتجبين ، وأزواجه أمهات المؤمنين ، رحمة الله عليهم أجمعين .

واته : من محمد ی کوڕی الحسين ی الآجري له مەککە، وتی : حمد بۆ ئەو الله یەی فەزڵی خۆی کرد بەسەرمان بە نیعمەتە قەدیمەکان، وە دەستە جوانەکان، حمدی کەسێک دەزانێ پەروەردگاری حمدی خۆشدەوێت، حمد بۆ ئەو لەسەر ئەو نیعمەتانەی ناژمێردرێن، چۆن دەژمێردرێ لە کاتێکدا گەورەکەی بفەرموێت 《وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا》 .

وە داوای زیادکردنی لێدەکەم بە فەزڵی خۆی، وە یارمەتیدان لەسەر شوکرکردنی، بەڕاستی ئەو خاوەن فەزڵێکی گەورەیە.

الله صلاة بدات لەسەر مژدەدەر و ترسێنەر، چرای ڕۆشنکەر، سەرگەورەی یەکەمەکان، ئەوە محمدە رسول ی پەروەردگاری جیهانیان، وە لەسەر آل و بەیتە پاکەکەی وە هاوەڵە ڕێزدارەکانی، وە خێزانەکانی دایکانی بڕواداران، ڕەحمەتی الله لەسەریان بێت گشتیان .

أما بعد :

فإن سائلا سأل عن العلم الذي يجب على المسلم علمه ، والعمل به ، ولا يسعه جهله ، ولا يكون به معذورا إذا جهله . فأحب السائل أن يعلم من ذلك ما يرغبه في طلب العلم الذي لا بد له منه ، خشية أن يطلب من العلوم ما غيره أولى به . والله ولي التوفيق .

الجواب وبالله التوفيق للصواب من القول والعلم :

اعلم . رحمنا الله وإياك . أنه واجب على كل مسلم ، عاقل ، بالغ ، غني كان أو فقير ، شريف وغير شريف ، حر أو مملوك ، ذكر أو أنثى ، صحيح أو زمن :

- علم معرفة الله سبحانه بصفاته .
- وعلم ما تعبدهم الله عَزَّ وَجلَّ من عبادته ، وأداء فرائضه ، واجتناب محارمه .
- وعلم الإخلاص الله عَزَّ وَجلَّ في جميع ما تعبدهم به حتى يكون الله عَزَّ وَجلَّ خالصا لا لغيره .
- وعلم معرفة عدوه الشيطان ليتخذوه عدوا .

• وعلم معرفة أنفسهم الأمارة بالسوء على حسن ذكر .

الله الكريم لطلب علم ما ذكرت ، فقد أراد الله [ به خيرا كما وعد ﷺ في الحديث ، ومن يرد الله به خيرا ؛ فقهه في | [ الدين ] ) .

أما بعد :

پرسیارکەرێک پرسیاری کرد دەربارەی ئەو زانستەی واجبە مسوڵمان بیزانێت، و کاری پێبکات، ناکرێ نەیزانێ، بیانووی بۆ نییە لە نەزانینیدا .

پرسیارکەرەکە حەز دەکات بزانێ لەوەی کە ویستی بۆ درووستدەکات بۆ داواکردنی ئەو زانستەی کە گومان نییە لە پێویستییەتی، لەترسی ئەوەی نەوەک زانستانێک داوابکات کە جگە لە خۆی لە پێشترە لەو بۆ داواکردن .

الله ش پشتیوانی سەرکەوتنە .

بەخشینی سەرکەوتن بۆ ڕاستی لە قسە و کردار لەلایەن اللهوەیە، وەڵام :

بزانە الله ڕەحم بە ئێمە و ئێوەش بکات،کەوا واجبە لەسەر هەموو مسوڵمانێک، عاقڵ، باڵغ بوو، دەوڵەمەند بێ یان فەقیر، خاوەن حەسەب و نەسەبێکی دیاربێت یاخود خاوەنی نەبێ، ئازاد یان بەندە، نێر یان مێ، تەندرووست بێ یان نەخۆش :

. زانستی ناسینی الله بەسیفاتەکانی، پاک و پێگەردیی بۆ ئەو .

. زانستی ئەوەی الله بۆ پەرستشی خۆی بۆی داناون، و جێبەجێکردنی فەرزەکانی و خۆبەدوورگرتن لە حەرامکراوەکانی .

. وه زانستی پاڵفتەبوونی نیەت بۆ الله عزَّوجل لە هەموو پەرستشەکانی تاوەکو بە پاڵفتەیی بۆ الله بێت، نەوەک بۆ جگە لەو .

.وه زانستی ناسینی دوژمنەکەیکە شیطان ە، بۆ ئەوەی بە دوژمنی خۆیانی دابنێن .

.وه زانستی ناسینی نەفسە فرمانکەرەکەیان بە خراپە لەڕووی باش باسکردنی....

الله کریم ە بۆ داواکردنی ئەو زانستەی باسمکرد، الله ویستی خێری بۆی هەبووە وەک چۆن باسکراوە لە حدیث، هەر کەسێک الله ویستی خێری بۆی هەبێت لە دین تێی دەگەیەنێت .

باب (١)

## ﴿ من فقهه الله في الدين ﴾

## [ ئەو كەسەی كە الله شارەزای كردووە لە تێگەیشتنی دین ]

٢- أنبأنا أبو مسلم إبراهيم بن عبد الله الكشي، أنبأنا سليمان بن داود الشاذكوني،أنا عبد الواحد بن زياد، نا معمر، عن الزهري، عن سعيد بن المسيب، عن أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ، قال : قال رسول الله ﷺ : ﴿من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين﴾

واته : رسول الله ﷺ ئەفەرموێت: ( هەر كەسێك اللهتعالى ويستى خەيرى بۆی هەبێ، تێیئەگەیەنێت لە دین ) .

٣- وحدثنا أبو بكر جعفر بن محمد الفريابي، نا محمد بن مسعود المصيصي، نا علي بن الحسن بن شقيق، أنا عبد الله بن المبارك، أنا يونس، عن الزهري، عن حميد بن عبد الرحمن، سمعت معاوية بن أبي سفيان ـ رضي الله عنهما ـ يخطب يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين).

واته : گوێم لە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو وتاری ئەدا ئەیفەرموو : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (هەر کەسێک الله تعالی ویستی خەیری بۆی هەبێ، تێی ئەگەیەنێت لە دین).

٤- حدثنا أبو محمد يحيى بن محمد بن صاعد، نا محمد بن زنبور المكي، حدثني إسماعيل بن جعفر، أخبرني عبد الله بن سعيد بن أبي هند، عن أبيه، عن ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ قال : قال رسول الله ﷺ : (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين) .

واته : لە ابن عباسەوە هاتووە، رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : (هەرکەسێک الله تعالی ویستی خەیری بۆی هەبێ، تێی ئەگەیەنێت لە دین).

٥- أنبأنا أبو عبد الله أحمد بن الحسن بن عبد الجبار الصوفي، نا محمد بن بكار نا عطاف بن خالد عن عبد الرحمن بن حرملة، حدثني سعيد بن المسيب، أنهقال : إن من أفضل العبادة: التفقه في دين الله، والتفكر في خلق الله .

واته : سعید بن المسیب وتی : (ئەفزەڵترین پەرستشەکان تێگەیشتنە لە دینی اللە، وە بیرکردنەوەیە لە درووستکراوەکانی الله عزَّوجل) .

٦- حدثنا أبو بكر عبد الله بن محمد بن عبد الحميد الواسطي، نا زهير بن محمد المروزي، أنا هارون بن معروف نا وكيع، عن موسى بن عبيدة، عن محمد بن كعبالقرظي ، قال : إذا أراد الله بعبد خيرا فقهه في الدين، وزهده في الدنيا، وبصره عيوبه، فمن أوتيهن؛ فقد أوتي خير الدنيا والآخرة .

واته : محمد بن كعب القرظي وتويەتی: (ئەگەر الله ویستی خێری بۆ بەندەیەکی هەبێ تێی ئەگەیەنێت لە دین، خۆی ئەگرێتەوە لە دونیا، چاورۆشنی ئەکات بۆ عەیبەکانی خۆی، هەر کەسێک ئەمانەی پێبەخشرا ئەوا خەیری دونیا و ئاخیرەتی پێ بەخشراوە).

قال محمد بن الحسين :

٧-فإن قال قائل : كيف صفة من فقهه الله عَزَّ وَجلَّ في دينه، حتى يكون ممن أراد الله تعالى به خيرا؟

قيل :

•و هو المسلم الذي قد علم أن الله عَزَّ وَجلَّ قد تعبده بعبادات، وجب عليه أن يؤديها إلى الله عَزَّ وَجلَّ كما أمره بها، لا كما يريد هو، ولكن كما أوجب العلم عليه ، فطلب العلم ليفقه ما تعبده الله عَزَّ وَجلَّ و به من أداء فرائضه، واجتناب محارمه .

• وعلم لا يسعه جهله، ولا يعذره به [العلماء العقلاء في تركه] ، [وذلك مثل]: الطهارة، وما يجب الله عَزَّ وَجلَّ قال عليه فيها .

ومثل : [الصلوات الخمس في اليوم والليلة، وما يجب الله] عليه فيها .

ومثل : الزكاة، وما يجب الله عَزَّ وَجلَّ عليه فيها؟

ومثل : الصيام، وما يجب الله عَزَّ وَجلَّ عليه فيه؟

ومثل : الحج، متى يجب عليه؟ وإذا وجب ما الله عَزَّ وَجلَّ عليه فيه؟

وعلم الجهاد، متى يجب؟ وإذا وجب ما الله عَزَّ وَجلَّ عليه فيه؟

وعلم المكاسب، وما يحل منها وما يحرم؟ ليأخذ الحلال بفقه وعلم، ويترك الحرام بفقه وعلم .

وعلم النفقات الواجبات عليه، وغير الواجبات .

وعلم بر الوالدين.

وعلم صلة الأرحام، والنهي عن قطعها .

وعلم الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر .

وعلم النكاح إذا أراده ، حتى يجري نكاحه بفقه .

وعلم معاشرة الزوجة ، وما أوجب الله عَزَّ وَجلَّ لها عليه من الحق ، وما وجب له عليها من الحق ، حتى يجري ذلك كله بفقه وعلم قد تقدم .

ثم علم صحبة الأصحاب ، ومحادثة الإخوان ، ومجاورة الجيران .

ثم علم حفظ الجوارح عن كل ما حرمه الله الكريم .

ثم علم اللباس ، مما هو مباح للرجال ، ومحظور على النساء . وما هو مباح للنساء ، ومحظور على الرجال .

ومثله الطيب ، والحلي .

ثم علم المأكول ، والمشروب ؛ إذ في المأكول مباح وغير مباح ، وفي المشروب مباح ، وغير مباح .

ثم علم كيف الشكر الله عَزَّ وَجلَّ ما أولى من نعمه .

ثم طلب الفقه ، يعلم كيف التوبة من كل ذنب أذنبه مما بينه وبين الله عَزَّ وَجلَّ؟ وكيف التوبة من الذنوب التي بينه وبين المخلوقين ؟

واته : ئەگەر قسەكەرێک وتی: سیفەتی ئەو کەسە چۆنەکە اللَّه تێیئەگەیەنێت لە دین، هەتا لەوکەسانە بێکە الله تعالی خێری بۆیان ویستووە؟

وتی: ئەوە ئەو مسوڵمانەیە کە وا دەزانێت الله عَزَّ وَجلَّ کردوویەتی بە بەندەی خۆی بە پەرستشەکان، واجبیکردووە لەسەری پێیان نزیک بێتەوە لە الله عزَّوجل، وەک ئەوەی اللَّه عزَّوجل فرمانی پێکردووە، نەوەک ئەوەی خۆی دەیەوێت، بەڵام وەک چۆن اللَّه عزَّوجل داواکردنی زانستی واجب کردووە لەسەری، داواکردنەکەشی بۆ زانست بۆ تێگەیشتن بووە لەوانەی اللَّه عزَّوجل ی پێ دەپەرستێ لە جێبەجێکردنی فەڕزەکان و دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان .

وه علمێک كه نابێ نەزان بێ پێی، وه عوزریشی بۆ نیه تیایدا [زاناكان عاقل ەكان له تەرک كردنی]، ئەمەش وەكو، پاكوخاوێنی و ئەوەی تێیدا واجبه لەسەری بۆ اللَّه عزَّوجل .

وه وەكو : [پێنج نوێژەكه] [له شەو و ڕۆژدا و ئەوەی واجبه بۆ اللَّهعزَّوجل] تێیدا .

.وەک زەكات و چی واجبه لەسەری تیایدا بۆ اللَّه عزَّوجل ؟

.وه وەک ڕۆژوو و ئەوەی واجبه لەسەری تیایدا بۆ اللَّه عزَّوجل ؟

.وه وەک حەج، چ كاتێ واجبه لەسەری؟ وه [كه واجب بوو] چی واجبه تیایدا بۆ اللَّه عزَّوجل؟

.وه زانستی جیهاد، كەی واجبه؟ و كه واجب بوو چی واجبه تیایدا بۆ اللَّه عزَّوجل؟

. وه زانستی بژێوی پەیاكردن، چی حەڵاڵه تیایدا و چی حەرامه تیایدا؟ بۆ ئەوەی حەڵاڵەكه وەربگرێت به تێگەیشتن و علمەوە، و حەرامەكەش واز لێبێنێت به تێگەیشتن و علمەوە.

.وه زانستیكێشانی خەرجییەكان ، واجبەكان و نا واجبەكان.

.زانستی چاكەكردن لەگەڵ دایک و باوک .

.زانستی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیی و ڕێگریكردن له پچڕاندنی.

.زانستی فرمان كردن به چاكه و ڕێگریكردن له خراپه.

. زانستی هاوسەرداریی، کاتێ ویستی، تاوەکو هاوسەرگیرییەکەی لەسەر تێگەیشتن بچێت بەڕێوە.

.زانستی تێکەڵییکردن لەگەڵ ئافرەتەکەی، وە ئەو حەق و مافانەی اللَّه عزَّوجل واجبی کردووە لەسەر ئافرەتەکە لە بەرامبەر پیاوەکە، وە ئەو حەق و مافانەی اللَّه عزَّوجل واجبیکردووە لەسەر پیاوەکە لە بەرامبەر ئافرەتەکەیدا .

تاوەکو ئەمە هەمووی لەسەر زانست و تێگەیشتن بڕوات کە لە پێشتردا هاتووە.

پاشان زانستی هاوڕێیەتی کردنی هاوڕێیان و  و قسەکردن لەگەڵ خوشک و برایان و دراوسێیەتیکردنی دراوسێ .

پاشان زانستی پاراستنی ئەندامەکان لە هەموو ئەوانەی [اللَّه ی بەخشندە حەرامیکردوون].

پاشان زانستی پۆشاک و جلوبەرگ، چی ڕێگە پێدراوە بۆ پیاوان و چی قەدەغەکراوە لە ئافرەتان، وە چی ڕێگەپێدراوە بۆ ئافرەتان و چی قەدەغەکراوە بۆ پیاوان.

وەکو بۆن و بابەتی ڕازانەوە

پاشان زانستی ئەو خواردنانەی ئەخورێت و ئەو شتانەی ئەخورێتەوە، کە لە خواردنەکاندا ڕێگەپێدرا و وڕێگەپێنەدراو هەیە،و لە خواردنەوەکانیش ڕێگەپێدرا و ڕێگەپێنەدراو هەیە.

پاشان زانستی ئەوەی چۆن سوپاسی اللّه تعالی بکرێ لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە پێی بەخشیوە.

پاشان داواكردنى تێگەیشتن، دەزانێ چۆن تەوبە دەكات كاتێک تاوانێک دەكات لە نێوان خۆی و اللَّه عزَّوجل؟

وە چۆن تەوبە دەكات لەو تاوانانەی نێوان خۆی و درووسكراوەكانە؟

قال محمد بن الحسين :

هذا يطول شرحه ، فمن وفقه الله عَزَّ وَجلَّ مول لطلب علم ما ذكرت ؛ ليعبد الله في جميع ما تقدم ذكرنا له ، ومما لم أذكره مما يطول به الكتاب ، فعبد الله عَزَّ وَجلَّ فيه بفقه وعلم ؛ فهو ممن أراد الله الكريم به خيرا ؛ إذ لم يتركه في الجهل .

واعلم أنه من عبد الله عَزَّ وَجلَّ بفقه وعلم فإنه يرضي الله عَزَّ وَجلَّ ، ويغيظ الشيطان ، وينفع نفسه في الدنيا والآخرة ، وينفع [ أهله ] وإخوانه .

وهذا الذي ذكرته لك وفضلته هو العبادة الله عَزَّ وَجلَّ ، هذا أولا .

ثم صيام النهار ، وقيام الليل ، والجهاد ، والحج ، والصدقة الكثيرة . .. وفقه .. علم قد تقدم .

وقد روي [ في ذلك أخبار ] ما يدلك على ما فضلته لك . ..

وأنا أذكره ليرغب في طلب العلم [ ... الله عَزَّ وَجلَّ عن عبادة يرضاه ] منك ، والله الموفق لذلك .

واتە محمد كوڕی حسين وتی :

ئەمە شیکردنەوەی درێژەئەکێشێ، هەر کەسێک الله تەوفیقی پێبدات بۆ داواکردنی ئەوەی باسمکرد، بۆ ئەوەی الله بپەرستێ لە هەموو ئەوانەی باسمانکرد، وە هەموو ئەوانەشی باسم نەکردووە لەبەر درێژبوونەوەی کتێبەکە، الله بپەرستێ تێیدا بە تێگەیشتن و زانستەوە، ئەوا ئەو کەسە لەوانەیە کە الله ی بەخشندە ویستی خێری بۆی هەبووە ئەگەر لە نەزانیی وازی لێنەهێناوە.

بزانە بەڕاستی هەر کەسێک الله بپەرستێ بە تێگەیشتنەوە، ئەوا الله ڕازی دەکات، وە شیطان تووڕەدەکات، وە سوود بەخۆی دەگەیەنێت لە دونیا و دواڕۆژ، وە سوود دەگەیەنێت بە [خزم و کەسی] و براکانی .

ئەمەی کە باسمکرد بۆت و شیمکردەوە بەرستشە بۆ الله، ئەمە یەکەم .

پاشان ڕۆژووی ڕۆژ، وە هەڵسانی شەو، و جیهادکردن، حەج، بەخشینی زۆر .... و تێگەیشتن .... زانستێکە هی پێشتر .

وە گێڕڕاوەتەوە [دەربارەی ئەوە چەند هەواڵێک] کە ڕێنموونیت دەکەن بۆ ئەوەی بۆم ڕوونکردیتەوە....

وە من باسی ئەکەم بۆ ئەوەی حەز بە داواکردنی زانست بکات [....الله پەرستشێک کە ڕازییە] لێت،الله ش سەرخەرە بۆ ئەوە .

٨- حدثنا أبو جعفر محمد بن الحسن بن بدينا الدقاق، نا هارون بن عبد الله الحمال _ ويقال: البزاز _، نا يزيد بن هارون، أنا يزيد بن عياض، عن صفوان بن سليم، عن سليمان بن يسار عن أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ، عن النبيﷺ قال: (ما عبد الله عز وجل ، بشيء أفضل من فقه في دين، ولفقيه اشد على الشيطان من ألف عابد،

ولكل شيء عماد، وعماد هذا الدين : الفقه .)

واته : رسول الله ﷺ ئەفەرموێت: ﴿ اللَّه عزَّوجل نەپەرستراوە بە شتێک ئەفزەڵتر بۆ لە تێگەیشتن لە دین، بەدڵنیاییەوە یەک کەسی تێگەیشتوو لە دین قورسترە لەسەر شیطان فریوی بدات لە هەزار کەسی عابد و پەرستشتکار، هەموو شتێک کۆڵەکە و پشت یێکی هەیە، پشت ی ئەم دینەش فیقهە ﴾ .

٩- حدثنا أبو محمد جعفر بن احمد بن عاصم الدمشقي ، ثنا هشام بن خالد الأزرق، نا الوليد بن مسلم عن أبي سعد : روح بن جناح، عن مجاهد، عن ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ ، عن النبي ﷺ ، قال : (فقيه واحد أشد على الشيطان من ألفي عابد)

واته : رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : ﴿ یەک کەسی تێگەیشتوو لە دین قورسترە لەسەر شیطان فریوی بدات لە هەزارکەسی خواپەرست ﴾ .

١٠- حدثنا أبو القاسم إبراهيم بن الهيثم الناقد، نا داود بن رشيد، نا الوليد بن مسلم ، عن أبي سعد روح بن جناح، عن مجاهد، قال: بينا نحن وأصحاب ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ كان جلوس في المسجد :طاووس، وسعيد بن جبير ، وعكرمة ؛ وابن عباس قائم يصلي ، اذ وقف علينا رجل ، فقال : هل من مفت؟

فقلنا :سل .

فقال : إني كلما بلت تبعه الماء الدافق .

قال : قلنا : الذي يكون منه الولد؟

قال: نعم .

قلنا: عليك الغسل .

قال: فولى الرجل وهو يرجع .(يعني يقول : إنا لله وإناإليه راجعون)

قال : وعجل ابن عباس في صلاته، ثم قال لعكرمة : علي بالرجل .

وأقبل علينا فقال: أرأيتم ما أفتيتم به هذا الرجل؛ عن كتاب الله عز وجل ؟

قلنا : لا .

قال: فعن سنة الرسول الله ﷺ ؟

قلنا : لا.

قال: فعن أصحاب الرسول الله ﷺ ؟

قلنا: لا.

قال: فعمه؟!

قال:قلنا: عن رآينا !!

قال: لذلك يقول رسول الله ﷺ (فقيه واحد أشد على الشيطان من الف عابد).

قال: وجاء الرجل ، فأقبل عليه ابن عباس، فقال : أرأيت إذا كان منك ، أتجد شهوة في قبلك؟

قال: لا.

قال: فهل تجد خدران في جسدک؟

قال: لا.

قال: فإنما هذهإبردة ، يجزيك منها الوضوء.

واته : مجاهد وتی : له کاتێکدا ئێمه دانیشتبووین لەگەڵ هاوەڵانی ابن عباس له مزگەوت، طاوس، سعید بن جبیر و عکرمة، ابن عباس وەستابوو لەسەرپێ نوێژی دەکرد، پیاوێک لامان وەستا و وتی: کەسێک هەیه فتوا بدات؟ وتمان : پرسیار بکه .

وتی : من هەرکاتێ میز ئەکەم بەدوایدا ئاوێکی مڵقدەر دێت.

وتمان : ئەو ئاوەی مناڵی لێ درووست دەبێ؟

وتی : بەڵێ.

وتمان: پێویستە غوسڵ دەربکەیت.

پیاوەکە ڕۆیشت و ئەیوت إنا لله وإنّا إليه راجعون .

ابن عباس پەلەی کرد لە نوێژەکەیدا، وتی بە عکرمة : پیاوەکەم بۆ بێنن، ڕوویکردە ئێمە و وتی : ئەمەی فتواتان پێداوە بۆ ئەم پیاوە لەکتابی اللە عَزَّ وَجلَّ ـە؟

وتمان: نەخێر.

وتی: ئەی لە سوننەتی رسول اللە ـوەیە؟

وتمان : نەخێر.

وتی : ئەی لەسەر چی؟!

وتمان: بە ڕەئی خۆمان.

وتی: بۆیە رسول اللە ﷺ ئەفەرموێ: ﴿یەک کەسی تێگەیشتوو لە دین قورسترە لەسەر شیطان فریوی بدات لە هەزارکەسی خواپەرست﴾.

وتی: پیاوەکە هات و ابن عباس بەرەولای چوو، وتی کاتێ ئەمە ئەبینی، ئایە هەست بە هیچ ئارەزوویەک ئەکەی لەدواتەوە؟

وتی: نەخێر.

وتی : هیچ سڕبوونێک هەست پێدەکەی لەلاشەت؟

وتی : نەخێر .

وتی : ئەوە تەنها تەڕوونێکە بە دەسنوێژ لەسەرت لادەچێ .

قال محمد بن الحسين :

١١- فهذه . . . يفقه [الله عز وجل فيه]حتى لا يأتي بباب من الأبواب من أمور الدنيا والآخرة إلا بفقه وعلم.

ثمأعلم - ارحمك الله - أن هذا الذي تقدم ذكري له ، هو فرض على من ذكرنا ، لأن طلب العلم فريضة على كل مسلم .

فينبغي لكل مسلم عقل عن الله عز وجل أن لا يشغله شيء عن طلب الفقه في جميع سعيه لأمر دنياه وأمر آخرته؛ وإلا فسد عليه جميعأموره ، وكان غير معذور بجهل عبادته الله عز وجل .

واته : محمدی کوڕی حسین وتی :

ئەمە الله عزَّوجل تێی دەگەیەنێت لە دین، تاوەکو نەگات بە هیچ دەروازەیەک لە دەروازەکان لە کاروباری دونیا و قیامەت ئیللا بە تێگەیشتن و زانستەوە نەبێت .

پاشان بزانە ڕەحمەتی الله ـت لێبێ، ئەوەی باسمکرد لە پێشتردا فەرزە لەسەر ئەو کەسەی باسمانکرد، چونکە داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو مسوڵمانێک .

بۆیە پێویستە لەسەر هەر کەسێک کەوا عاقل بووە دەربارەی الله عزَّوجل هیچ شتێک سەرقاڵی نەکات لە داواکردنی تێگەیشتن لە سەرجەم هەوڵەکانی لە

کاروبارەکانی دونیاکەی و کاروبارەکانی قیامەتەکەی، گەرنا سەرجەم کاروبارەکانی تێکدەچێ و بیانووی بۆ ناهێنرێتەوە لە نەزانبوونی لە پەرستنی اللەعزَّوجل [مەبەست پێی هەموو کەسێکی عاقڵ ئەبێ داوای زانست بکات و هەوڵی بۆ بدات]

.

**١٢.** أخبرناأبو سعيدأحمد بن زياد الاعرابي ، نا أبو جعفر الحضرمي ، نا هشام ابن يونس ، نا المحاربي ، عن بكر بن خنيس ، عن ضرار بن عمرو ، عن ابن سيرين ، قال: ان اقواما تركوا العلم ومجالسة العلماء ، واتخذوا المحارب فصلوا وصاموا حتييبس جلد احدهم على عظمه ، ثم خالفوا سنة فهلكوا !

ألا والله الذي لا اله غيره ما عمل عامل قط على جهل إلا كان ما يفسد اكثر مما يصلح.

واتە : ابن سيرين رحمه الله وتی : کەسانێک وازیان هێنا لە زانست و دانیشتن لەگەڵ زانایان، کۆشکی بەرز و قایمیان درووستکرد، نوێژیان کرد و ڕۆژوویان گرت هەتاوەکو پێستی یەکێکیان وشک بوویەوە بەسەر ئێسکەکەیدا، پێچەوانەی سوننەتیان کرد و تیاچوون!! سوێند بەو پەروەردگارەی هیچکەسێ شایەنی پەرستن نیە جگە لەو، هیچ کارکەرێک نیە کار بکات لەسەر جەهل و نەزانیی ئیللا ئەوەی تێکی دەدات زیاترە لەوەی چاکی دەکات .

[واتە ئەوانەی کردەوەیەک دەکەن بۆ ئەوەی هیچ علمێکیان پێی هەبێت ئەمانە خراپی زیاتر دەنێنەوە وەک لەوەی حاڵی ئوممەت چاک بکەن، ئەمە مانای ئەوەیە کە هیچ عملێک بۆ علم نابێت، وە علم یش بۆ عمل نابێت] .

باب (٢)

# ﴿ فرض طلب العلم على المسلم ﴾

## [ دەروازەی فەرزیەتی داواکردنی زانست لەسەرمسوڵمان ]

**١٣.** اخبرنا ابو جعفر احمد بن يحيي الحلواني ، نا الحكم بن موسى ، نا غسان بن عبيد ، عن أبى عاتكه ، أنس بن مالک رضي الله عنه ، قال : قال رسول اللهﷺ : (طلب العلم فريضة على كل مسلم ).

واتە : ئەنەسی کوڕی مالیکڕەزای خوای لێبێ دەفەرموێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿ داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو مسوڵمانێک ﴾

**١٤.** نا أبو يعقوب إسحاق بن أبي حسان الأنماطي، نا هشام بن عمار الدمشقي عن كثير شنظير عن أنس بن سيرين، عن أنس بن مالك رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ: (طلب العلم فريضة على كل مسلم).

واتە: لە ئەنەسیکوڕی سیرین ـەوە، ئەنەسی کوڕی مالیک ڕەزای خوای لێبێ دەفەرموێ: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو مسوڵمانێک﴾.

١٥- حدثنا أبو العباس بن سهل الأشناني، نا محمد بن بكار، نا حفص بن سليمان، وذكر الإسناد مثله سواء .

واته: ابو العباس بن سهل الأشناني به هەمان ئیسناد گێڕایەوە .

١٦- حدثنا أبو بكر بن أبي داود السجستاني، نا جعفر بن مسافر، نا يحيى بن حسان، عن سليمان بن قزم، عن ثابت، عن أنس بن مالك رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ : (طلب العلم فريضة على كل مسلم).

قال أبو بكر [ابن أبي داود]: سمعت أبي يقول : هذا أصح حديث روي في طلب العلم فريضة على كل مسلم .

واته: ئەنەسی کوڕی مالیک ڕەزای خوای لێبێ گێڕایەوە، ڕسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿ داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو مسوڵمانێک﴾ .

١٧- حدثنا أبو سعيد أحمد بن زياد الأعرابي، انا عباس بن محمد بن حاتم وجعفر بن عامر العسكري، والحسن بن علي العامري، جميعا قالوا: نا الحسن بن عطية عن أبي عاتكة، عن أنس بن مالك رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ :( اطلبوا العلم ولو بالصين ).

وفي حديث جعفر بن عامر: (فإن طلب العلم فريضة على كل مسلم ).

واته : رسول الله ﷺ فەرموويەتی: ﴿ داوای زانست بکەن ئەگەر لە چین یش بێت ﴾، وە لە حدیث ی جەعفەری کوڕی عامرەوە ﴿چونکە داواکردنی زانست فەرزێکە لەسەر هەموو مسوڵمانێک ﴾ .

١٨- أنا أبو العباس أحمد بن موسى بن زنجويه القطان، نا عثمان بن عبد الله العثماني، نا عبد الله بن لهيعة، عن محمد بن زيد، عن أبي سلمة بن عبد الرحمن، عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ : ( طلب العلم فريضة على كل مؤمن يؤمن بالله واليوم الآخر )

واته: رسول الله ﷺ دەفەرموێت: ﴿داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو بڕوادارێک، کە باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە﴾ .

قال محمد بن الحسين :

١٩- فإن قال قائل:

فإن العلم كثير لا يدركه كل أحد، ففرض على كل مسلم طلبه ؟!

قيل له: العلم على وجوه كثيرة :

•فمنه علم لا يسمع المسلم جهله، غنيا كان أو فقيرا، صحيحا أو زمنا، حرا أو عبدا ، إذا كان عاقلا بالغا في كل وقت، وفي كل زمان، مما ينبغي أن يكون مصحوبه في الحضر والسفر، وعند كل حال :

• وذلك معرفة الله عز وجل بصفاته ، بصحة توحيده، وإخلاصه فيه .

• ومعرفة عدوه إبليس.

• ومعرفة نفسه الأمارة بالسوء.

• ومعرفة طهارته، وصلاته ؛ كيف يؤدي خمس صلوات الله عز وجل في كل يوم وليلة؟

• وكمال الطهارة، والغسل من الجنابة .

هذا ما لا يسع كل مسلم جهله، بل فرض على كل من ذكرنا علمه، والعمل به .

• وعلم معرفة ما بني عليه الإسلام إذ:

واته : محمدى كوڕى حسين وتى :

ئەگەر قسەكەرێك وتى :

بەڕاستى زانست زۆرە و هەموو كەسێك پێى ناگات، فەڕزە لەسەر هەموو مسوڵمانێك داواى بكات؟!

پێى دەوترێت : زانست لە چەند ڕوويەكى زۆرەوەيە :

. لەوانە زانستێکە ناکرێ مسوڵمان نەزان بێت دەربارەی، دەوڵەمەندبێیان هەژار، تەندرووستبێیان نەخۆش بێ، ئازاد بێت یاخود بەندە، ئەگەر عاقل بوو و باڵغ ببوو لە هەموو کاتێکدا، لەهەموو ڕۆژگارێکدا، پێویستە لەگەڵی بێت لە کاتی نیشتەجێبوون لە شوێنی خۆییان لە کاتی سەفەرکردن، وە لەهەموو بارودۆخێکدا :

. لەوانە ناسینی الله عزَّ و جل بە سیفاتەکانی، بە درووستێتی یەکخواپەرستییەکەی و دڵسۆزیی تیایدا.

.وە ناسینی دوژمنەکەی إبلیس .

.وە ناسینی نەفسە فرمانکەرەکەی بە خراپە.

. وە زانینی پاک وخاوێنیەکەی و نوێژەکەی، چۆن پێنج نوێژەکەی بەئەنجام دەگەیەنێ لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا؟

.زانینی تەواوی پاک و خاوێنی و غوسڵکردن لە جەنابەتدا.

ئەمانە ناکرێ مسوڵمان نەزان بێت تیایاندا، بەڵکو واجبە لەسەر هەموو ئەوانەی باسمانکرد زانستبوون پێیان و کردەوەکردن پێیان .

وە زانستبوون بەوانەی ئیسلامی لەسەر بنیاتنراوەکە :

**٢٠.** قال النبيﷺ : (بني الإسلام على خمس: شهادة أن لا إله إلا الله، وأن محمدا رسول الله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وصوم شهر رمضان، وحج البيت على من استطاع إليه سبيلا).

ليس يسع المسلم أن يجهل ذلك، وفرض عليه علمه حتييكون مصحوبه في كل وقت، حتى إذا رزقه الله الكريم مالا علم ما الله عز وجل عليه [ فيخرجه ] .

• وإذا ورد شهر رمضان علم كيف يصومه، وما يحل له فعله ، وما يحرم عليه ...

• وهكذا إذا ورد وقت الحج، علم أنه ممن [فرض] عليه الحج، طلب العلم لأداء ما فرض الله عليه من الحج، لا يسعه أن يحج بجهل ، [فصار ] فرضا .

• وهكذا إذا أراد الجهاد طلب علم ما يجب عليه من أحكام الجهاد، ولا يسعه أن يجاهد بجهل، فصار فرضا .

•وهكذا إذا اتجر بالأموال، وهو لا يعلم الحلال من المكاسب، ولا ما المحرمات منها ، وجب عليه فرضا طلب علم ذلك .

واته: رسول الله ﷺ دەفەرموێت: ﴿ئیسلام بنیاتنراوە لەسەر پێنج: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە الله نەبێ، وە محمد یش نێردراوی الله یە، بەرپاکردنی نوێژ و زەکات دەرکردن وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕمەزان، وە حەجکردن لەسەر هەرکەسێ توانای هەبوو بەسەریدا﴾ .

ناكرێ مسوڵمان نەزان بێ بەوانە، فەڕزە لەسەری زانستی هەبێ پێی، تاوەکو لە هەموو کاتێکدا لەگەڵی بێت، هەتا کاتێک الله عزَّ و جل سامانی پێبەخشی بزانێ چی لەسەرە بەرامبەر الله عزَّ و جل [تاوەکو دەری بکات].

. وە کاتێ گەیشت بە مانگیڕەمەزان دەزانێت چۆن ڕۆژووەکانی بگرێت، وە چی حەڵاڵە بۆی بیکات، [ئەوەشی حەرامە].

. هەروەها کاتێک گەیشت بە وەرزی حەجکردن، دەزانێت لەو کەسانەیە کەوا حەجیان لەسەر فەڕزە، داوای زانست دەکات بۆ بەجێگەیاندنی ئەو شتانەی اللهعزَّ و جل فەرزی کردووە لەسەری لە حەجەکەدا، ناتوانێ حەج بکات بە نەزانی، بۆیە بووەتە فەڕز .

. هەروەها کاتێ ویستی جیهاد بکات داوای زانستی حوکمەکانی جیهاد دەکات، ناتوانێ بە نەزانیی جیهاد بکات، بۆیە بوو بە فەرز .

. بەو جۆرەکاتێ ویستی بازرگانی بکات بە ماڵ و سامان و نازانێت لە کاسبیەکان چی حەڵاڵە، ناشزانێت کامانە حەرامن تیایدا، بۆیە واجبە لەسەری داوای زانستی ئەوە بکات .

**٢١. قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه : لا يجر في سوقنا إلا من فقه ، وإلا أكل الربا .**

وصدق عمر رضي الله عنه ، إذا كان الإنسان لم يتقدم في طلب العلم لما يحل من البيع، وما يحرم منه، ولا الصحيح منه، ولا الفاسد، أكل الربا، وأكل الباطل .

•وهكذا إذا أراد الدخول في أمر واجب عليه، أو مباح له أخذه ، لم يسعه الدخول فيه حتى يطلب علم ذلك .

فصار فرضا عليه طلب العلم بهذا النعت، وبهذه الصفحة، وما يشبهها من أمور الدنيا والآخرة .

ولا يقدم عليها إلا بعلم، وإذا لم يكن معه علم ففرضت عليه طلب العلم لذلك العمل الوارد عليه .

وهذا يطول شرحه، والله الموفق لمن أحب .

واته : عمر بن خطاب رضي الله عنه فەرمووی : ﴿هیچکەسێ بازرگانی ناکات لەو بازارەمان: ئیللا لەسەر تێگەیشتن لە دین، یان ڕیبا دەخوات﴾ .

عمر ـ رضي الله عنه ـ ڕاستی فەرمووە، ئەگەر مرۆڤ لە پێشتردا داوای زانستی ئەو شتانەی نەکردبێ کە حەڵاڵن لە کڕین و فرۆشتنەکان، وە ئەوانەشی حەرامن تیایدا، وە درووستەکەی و خراپ و تێکچووەکەی، ئەوا ئەو کات ڕیبا دەخوات، باطل ئەخوات .

[ واتە گەرکەسێک هیچ زانستێکی نەبێت بەوەی کە دەیکڕێتیان دەیفرۆشێت ئەوا تووشی ڕیبا دەبێت .

بۆ نموونە/ کاتێ کەسێک دەیەوێت شتێک بکڕێت یان بفرۆشێت ئەبێ ئاگاداری ئەوانە بێت کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووە، وەک :

.فرۆشتنەوەی زێڕ بە زێڕ بەڵام کێشیان وەک یەک نییە .

.مامەڵەی**المنابذة** : واتە پیاوێک جلەکەی هەڵدا بۆ پیاوێکی تر ببێت بەماڵی پێش ئەوەی ئەمدیو و ئەودیوی بکات یان تەماشای بکات .

.مامەڵەی**الملامسة** : واتە هەر بەدەست لێدانێک ببێتە ماڵی بێ ئەوەی تەماشای بکات .

. مامەڵەی**المزابنة** : واتە ئەگەر بەرووبوومی باخەکەی خورما بوو بیفرۆشێت بە خورمای وشکی پێوراو یاخود باخەکەی ترێ بوو بیفرۆشێت بە مێوژی پێوراو .

چەندین مامەڵەی و کڕین و فرۆشتنی تریشکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووە و ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی کە ئەنجامی نەدەین ] .

. بەم شێوەیە کاتێک ویستی بچێتە ناو کارێکەوە واجبە لەسەری یاخود کارێک ڕێگەپێدراو بێت بۆی بیکات، ئەوا ناتوانێت هەتاوەکو داوای زانستەکەی دەکات .

فەرزە لەسەری داوای زانست بکات بەو وەسفە، وە هاوشێوەی ئەوە لە کاروبارەکانی دونیا و قیامەت .

بۆی ناچێتە پێشەوە ئیللا بە زانست نەبێ، وە ئەگەر زانستەکەی پێ نەبێ فەڕزە لەسەری داوای زانستی ئەو کارەبکات کە بۆی هاتۆتە پێش .

[لە هەموو ئەوکارانەی تۆ ئەنجامیان دەدەیت ئەبێت علمت پێیان هەبێت بۆئەوەی بەدرووستی و بەحەڵاڵی ئەنجامیان بدەیت] .

شیکردنەوەی ئەمە درێژە دەکێشی، الله ش سەرکەوتن ئەدات بە هەر کەسێک بیەوێت .

قال محمد بن الحسين :

فمن تدبر ما رسمته له من أول الكتاب إلى هاهنا علم أنه لا ينفك أبدا من طلبة العلم، لينتفي عنه الجهل بما أوجب الله عز وجل عليه من فرض عبادته في نفسه، وفي أهله، وفي ولده، وفي جميع سعيه فرضا لازما، يسعى إلى العلماء بإتعاب نفسه ، وإنفاق ماله ، وتغريبه عن وطنه ،

ولو إلى الصين، إذا كان لا يوجد العلم إلا بالصين .

واته : محمدی کوڕی حسین وتی :

هەر کەسێک تێڕابمێنێت لەوەی بۆم داڕشتووە لە سەرەتای کتێبەکەوە تا ئێرە دەزانێت کەوا نابێ هەرگیز دابڕێ لە داواکردنی زانست، بۆ ئەوەی نەزانیی لەسەر خۆی لابدات لەو شتانەی الله عزَّ و جل فەرزیکردووە لەسەری لە فەرزێتی پەرستنی لە نەفسی خۆیدا، لەناو خاو و خێزانی، لەناو منداڵەکانی، فەڕزێکی پێویست، لە هەوڵدابێت بۆ لای زاناکان بە ماندووکردنی نەفسی خۆی و خەرجکردنی ماڵ و سەروەتەکەی و نامۆکردنی خۆی لە وڵاتەکەی ئەگەر بۆ چین یش بێت، ئەگەر علم لەهیچ شوێنێک نەبێ جگە لە چین .

قال محمد بن الحسين :

ونحن نعلم - والحمد لله - أن العلم موجود في كثير من مدائن المسلمين، من طلبه وجده، واستغني عن الخروج إلى الصين .

واتە : محمدی کوڕی حسین وتی :

ئێمە دەزانین الحمدلله زانست بوونی هەیە لە زۆربەی شاری مسوڵمانان، هەر کەسێک داوای بکات دەیدۆزێتەوە و بێ پێویست دەبێ لە دەرچوون بۆ چین .

**٢٢.** فإن قال قائل:

إيش معنى قول النبي ﷺ : «اطلبوا العلم ولو بالصين» ، [فهل] العلم يضيق على الناس بالحجاز، وبالعراق، وبالشام، وباليمن، حتى يحتاج الناس الخروج إلى الصين ؟!

قيل له:

لا؛ ولكن تعظيما منه للعلم، ولما علم النبي ﷺ [أن أمته] من يسافر بماله [إلى] الصين في طلب الدنيا، ولا... بالجهل منها على حفظ ما لا مرجو .. المطلوب .. أمرك ذاك إلى .. ففرض عليهم طلب العلم . . . عليكم السفر إليه ولو بالصين حتى لا يعرض الناس جميعهم عن الخروج في طلبهم العلم مسيرة الميل والميلين، والفرسخ والفرسخين، واليوم واليومين؛ لأنه الأولى والأكبر من ذلك؛ لأنه أولى بهذا وأوجب عليهم من كل سفر لمن عقل .

واتە : ئەگەر قسەکەرێک وتی :

ماناى ئەو وتەيەى پێغەمبەرﷺ چيە؟ ﴿داواى زانست بكەن گەر لە چين يش بێت﴾، ئايا زانست لە حيجاز و عێراق و شام  و يەمەن كەمە و دەسناكەوێ تاوەكو پێويست بكات خەڵكى بچن بۆ چين؟!

پێى دەووترێ :

نەخێر، بەڵام وەک بەگەورە دانانێكى بۆ زانست، كاتێ پێغەمبەر ﷺ زانيويەتى كەسانێک لە ئوممەتەكەى دەردەچن بۆ چين بۆ داواكردنى دونيا، بۆيە فەرزيكردووە لەسەريان داواى زانست بكەن، پێويستە لەسەرتان سەفەر بكەن بۆى گەرچى لە چين يش بێت، تاوەكو خەڵكى گشتيان پشت هەڵنەكەن لە دەرچوونيان بۆ داواكردنى زانست بە ئەندازەى ميلێكيان دوو ميل، يان فەرسەخێک و دوو فەرسەخ، يانرۆژێكيان دوورۆژ، لەبەرئەوەى لەپێشترە و گەورەترە لەوە، لەبەرئەوەى داواكردنى زانست شايستەترە و واجبترە لە هەموو سەفەرێک بۆيان بۆ هەر كەسێک عاقڵ بێت .

قال محمد بن الحسين :

وقد رحل كل جماعة من الصحابة -رضي الله عنهم - بعضهم إلى بعض في طلب العلم [مما قد] أشكل عليهم .

واتە : محمديكوڕى حسين وتى :

کۆمەڵێک لە هاوەڵان گەشتیانکردووە بۆ لای یەکتر بۆ داواکردنی زانست لەو بابەتانەی ناڕوون بووە لایان .

**٢٣.** رحل أبو أيوب الأنصاري -رضي الله عنه - من المدينة إلى مصر إلى عقبة بن عامر، يسأله عن حديث سمعه من رسول ﷺ ، فسأله عنه في يوم دخل، فخبره به، فركب أبو أيوب راحلته من وقته ثم رجع إلى المدينة .

وقد رحل جماعة من التابعين إلى الشام من العراق، ومن الحجاز ، وسألوا عن الحديث والحديثين والأكثر .

ولنا فيه : (باب الرحلة في طلب العلم)، قد ذكرناه في غير هذا الكتاب إن شاء الله.

واتە : أبوأيوب الأنصاري گەشتی کرد لە مەدینە بەرەو میسر، بۆ لای عوقبەی کوڕی عامر، پرسیاری لێبکات دەربارەی حدیث ێک گوێی لێبووە لە رسول الله ﷺ، پرسیاری لێکرد ئەوڕۆژەی چووە ناو شارەکە، ئەویش هەواڵی پێدا،أبو أيوب یش هەر ئەوکاتەی گوێی لێبوو سواری ئەسپەکەی بوو و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە .

. کۆمەڵێک لە تابعین ەکان گەشتیانکردووە بۆ شام عێراق و حیجازەوە، پرسیاریانکردووە لە حدیث ێکیان دوو حدیثیان زیاتر .

قال محمد بن الحسين :

٢٤ - فإن قال قائل: فما العلم الذي يعذر الإنسان بجهله؟

قيل له: هذا كلام فيه جفاء؛ ولكن يقال له : جوابك، أن يقال لك :

الاشتغال بطلب علم ما تقدم ذكرنا له، هو واجب عليك، فإذا ثقل عليك طلب العلم الواجب، وسهل عليك الطلب العلم غيره مثل :

علم أخبار بني إسرائيل .

وقصص الأنبياء

وأخبار الخلفاء، وما شجر بينهم .

وأشياء لهذا .

قيل له: يا غافل ! لو جهلت هذا لما ضرك جهله .

وإذا جهلت ما يجب عليك علمه والعمل به لم تعذر بجهلك ، وكنت عاصيا لله عز وجل بجهلك ما يجب عليك .

ثم يقال له:

إذا أنت ألزمت نفسك طلب هذا العلم الواجب اللازم لك في حين الغني والفقر، وحين الصحة والسقم، وفي حين الحضر والسفر؛ لم نأمن بعد ذلك أن ترد عليك أمور لم يتقدم العلم بها، يلزمك طلب العلم لها مع ورودها عليك، ولو كنت طلبت علمها قبل أن تبتلى بها، كان أفضل لك [من طلب علم ليس ] واجبا عليك .

فإن قال: مثل ماذا ؟

قيل له : . . . كما يتخلف . . .، والحج بعد فعليك واجب أن تسعى إلى العلماء حتى تعلم كيف تحج] .

ومثل الجهاد.

ومثل: الطلاق، والنكاح، ومن يحل تزويجها ممن يحرم تزويجها .

ومثل : الخصومات التي تجري بين الناس في الحقوق، فإذا جهلت علمها وأشباه ذلك مما تبتلى به، وجب عليك السعي إلى العلماء، حتى تتخلص مما بليت به بعلم .

هذا وما أشبه ذلك يعذر الإنسان بجهله قبل وروده، فإذا ورد عليه لم يعذر بجهله، إذا كان إنما شغله عن طلب علم هذا حتى ورد عليه اشتغاله بطلب علم ما تقدم ذكرنا له .

فليس ينفك المؤمن العاقل أبدا من طلب العلم ما كان في الدنيا .

ثم اعلم - رحمك الله - أنه من كان مراده طلب العلم الذي لا يسعه جهله ، وحسنت فيه النية ، لم يلبثأنيوفقه الله عز وجل لطلب علم ما ذكرناه ،قبل وروده عليه ، خوفا أنيبتلي به.

واته : محمدى كوڕى حسين وتى:

ئەگەر قسەکەرێک وتى: ئەو زانستە چیەکە مرۆڤ  بیانوى بۆ دەهێنرێتەوە لە نەزانینى؟

پێى دەووترێ : ئەم قسەیە باتڵە،

بەڵام پێی دەوترێ : وەڵامەکەت ئەوەیە، بووترێ : بۆ تۆ هەیە سەرقاڵبوون بەو زانستانەی کە پێشتر باسمان کرد، وە ئەوە واجبە لەسەرت، ئەگەر لەسەرت گران بوو داواکردنی ئەو زانستەیکە واجبە لەسەرت، وە ئاسان بوو لەسەرت داواکردنی زانستی جگە لەو، وەکو :

- هەواڵ دەربارەی بەنی ئیسرائیل .

- چیرۆکی پێغەمبەران .

- هەواڵی جێنشینەکان و ئەوەیڕوویداوە لەنێوانیان .

وە هاوشێوەی ئەوانە .

پێی دەوترێ :

ئەی بێئاگا، ئەگەر نەزان بوویت بەوانە زیانت پێناگەیەنێت .

وە ئەگەر نەزان بووی بەوەیکە واجبە لەسەرت بیزانیت و کاری پێبکەیت ئەوکات بیانووت بۆ ناهێنرێتەوە لە نەزانینەکەتدا، لەوکاتەدا سەرپێچیکاری بۆ اللە عزَّوجل بە نەزانینت بەو شتانەی واجبن لەسەرت .

[واتە ئەو علمەیکە واجبە لەسەرت بیزانیت و کاری پێ بکەیت بەڵام تۆ نەیزانی و هەوڵی بۆ نەدەی و لەسەرت گران بێ، وە خەریکی علمێکی غیری ئەوە بیت ئەوا بیانووت بۆ ناهێنرێتەوە و سەرپێچیکاری لای اللە عَزَّ وَجلَّ ].

پاشان پێی دەوترێت :

گەر تۆ خۆت پابەندب کەیت بە داواکردنی ئەو زانستەیکە پێویستە لەسەرت، لە کاتی دەوڵەمەندی و هەژاریی، لە کاتی تەندرووستی و نەخۆشیی، لە کاتی نیشتەجێی و سەفەکردن، لە دوای ئەوە گرەنتی ئەوە ناکەین کار و بارانێکت بۆ بێتە پێش کە پێشتر زانستت پێی نەبووە، پێویستە لە سەرت داوای زانستەکەی بکەیت لەو کاتەدا کە کارەکە هاتووەتە پێشت، ئەگەر داوای زانستەکەیشت کردبێ پێش ئەوەی پێی تاقیبکرێیەوە، باشتربوو بۆت [لە داواکردنی زانستێک کە] واجب [نیە] لەسەرت.

ئەگەر قسەکەرێک وتی:وەک چی؟

پێی دەوترێ: ....... وەک ئەوەی جیاوازە ...... دواتر حەجکردن، پێویستە لە سەرت لە هەوڵداندا بیت بۆلای زاناکان تاوەکو بزانیت چۆن [حەج دەکەیت].

وە وەک جیهاد کردن .

هەروەها وەک، تەڵاقدان، هاوسەرگیری، وە کێ حەڵاڵە هاوسەرگیری بۆ بکرێ و کێ حەرامە هاوسەرگیری بۆ بکرێ.

وەکو ئەو ناکۆکیانەی لە نێوان خەڵکیی بەرپا دەبێ لە مافەکاندا، کاتێک نەزانبوویت بە زانستەکەی و هاوشێوەی ئەوەکە پێی تاقی دەکرێیتەوە، واجب دەبێت لەسەر لە هەوڵ و کۆششدا بیت بۆ لای زاناکان، تاوەکو بە زانستەوە کۆتایی بهێنیت بەوەی کە پێی تاقیکراویتەوە.

ئەمە و هاوشێوەی ئەوە مرۆڤ بیانووی بۆ دەهێنرێتەوە لە نەزانینیدا پێش ئەوەی پێی بگات، بەڵام کاتێ پێی گەیشت بیانووی بۆ ناهێنرێتەوە بە نەزانینی، ئەگەر

سەرقاڵبوو لە داواكردنی ئەو زانستە هەتاوەكو گەیشت بەوەی سەرقاڵبوو بە داواكردنی ئەو زانستەی كە لە پێشتردا باسمان كردووە.

بڕواداری عاقل دەستی بەرنابێ لە داواكردنی زانست تا ئەو كاتەی لە دونیا مابێ .

پاشان بزانە ڕەحمەتی الله ـت لێبێ، كەوا بەڕاستی هەر كەسێك داواكردنەكەی بۆ ئەو زانستەبێ كە ناتوانێ نەزان بێ پێی و نیەتەكەی باشبوو تێیدا، زۆری پێناچێ الله تەوفیقی دەدا بۆ زانینی ئەوەی باسمانكرد، پێش ئەوەی بگاتە سەری، لەترسی ئەوەی پێی تاقی بكرێتەوە.

[بۆ نموونە/ كەسێك زۆر هەوڵی فێربوونی تەوحید ئەدات و دەیەوێت فێربێت یاخود دەست دەگرێ بە قورئان و سوننەت وە كتێبەكانی سەلەف بە نیەتێكی باش بۆ ئەوەی تووشی تاقیكردنەوەی ئیمانی نەبێ، بۆ ئەوەی بەدوای كەسی مبتدیع نەكەوێ و گومڕا نەبێ، ئەوا الله ئەوانە تەوفیق دەدات پێش ئەوەی پێی تاقی بكرێنەوە . والله تعالى اعلم] .

**٢٥.** وروى عن الحسن أنه قال : من عمل بما يعلم ؛ وفقه الله عز وجل لعلم ما لم يعلم.

واتە : حسن وتی: ﴿هەر كەسێك كار بكات بەوەی دەیزانێ، الله تعالى تەوفیقی پێدەدات بۆ فێربوونی ئەوەی نایزانێت﴾.

قال محمد بن الحسين :

فالعاقل لا يستحسن لنفسه أنيكون جاهلا يعلميزيده شرفا به عند الله عز وجل وعند من عقل ؛ ولكنه مشغول بالواجب كيفيعبد الله عز وجل فيما الزمه ، فتزايد في طلب كل علم ينفع لا يشبع.

واته : محمديكورِى حسين وتى :

کەسی عاقڵ بەباشی نازانێت بۆ نەفسی خۆی کە نەزان بێت بە زانستێک کە پێگە و شانازیی زیاد ئەکات پێی لای پەروەردگار و کەسانی عاقڵ [واتە داوای هەموو علمێک دەکات کورتی ناکاتەوە لەوەی تەنیا لە یەک بابەتەدا علمی هەبێت بەڵکو لە هەمووی، ئەمەش سیفەتیکەسی عاقڵە]، بەڵام سەرقاڵە بە واجبەکان چۆن الله دەپەرستێ بەو شێوەیەی پابەندی کردووە پێوەی، بۆیە هەموو عیلمێک داوا دەکات سوودی هەبێ، تێر نابێ .

باب (٣)

## ﴿ فضل طلب العلم الله عزوجل ﴾

## [فەزڵی داواکردنی زانست لە پێناوی اللە عَزَّوَجَل]

**٢٦.** حدثنا أبو بكر قاسم بن زكريا المطرز، نا محمد بن الصباح الجرجرائي، نا جرير بن عبد الحميد، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي هريرة -رضي الله عنه -قال: قال رسول الله ﷺ: «من سلك طريقا يطلب فيه علما ؛ سهل الله تبارك وتعالى له طريقا إلى الجنة».

واته : ڕسول اللە ﷺ دەفەرمووێت: ﴿هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتەبەر داوای زانستی تیا بکات، اللە تعالی بەو کارەی ڕێگایەکی بۆ ئاسان دەکات بەرەو بەهەشت﴾.

**٢٧.** حدثنا أبو جعفر أحمد بن خالد البرذعي في مسجد الحرام، نا علي بن سهل الرملي، عن يحيى بن عيسى الرملي، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي هريرة - رضي الله عنه - قال : قال النبي ﷺ : «من سلك طريقا يبتغي فيه علما ؛ سهل الله تبارك وتعالى له طريقا إلى الجنة » .

واته : رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: ﴿هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتەبەر مەبەستی داواکردنی زانستێک بێت پێی، الله سبحانه وتعالی بەو کارەی ڕێگایەکی بۆ ئاسان دەکات بەرەو بەهەشت﴾.

**٢٨.** حدثنا أبو بكر عبد الله بن محمد بن عبد الحميد الواسطي، نا زهير بن محمد المروزي، نا عبد الرزاق، نا معمر، عن عاصم بن أبي النجود، عن زر بن حبيش، قال: أتيت صفوان بن عسال المرادي، فقال : ما جاء بك ؟

فقلت : جئت ابتغاء العلم .

فقال : سمعت رسول اللهﷺ يقول: «ما من رجل يخرج من بيته ليطلب العلم إلا وضعت له الملائكة أجنحتها رضا لما يصنع».

واته : زر ی کوڕی حوبەیش وتی: گەیشتم بە صفوان ی کوڕی عسال ی موڕادی، وتی: چی تۆی هێناوە؟ وتم: هاتووم بۆ داواکردنی زانست.

وتی: گوێم لێبوو رسول الله ﷺ دەیفەرموو: ﴿هیچ پیاوێک نیە لە ماڵ بچێتە دەر بۆ داواکردنی زانست، ئیللا فریشتەکان باڵەکانیان ڕادەخەن وەک ڕازیبوونێک بۆ ئەو کارەی ئەو پیاوە دەیکات﴾.

**٢٩.** وحدثنا أبو بكر - أيضا ، نا زهير بن محمد، نا عبيد الله بن موسى، عن شريك، عن عاصم بن أبي النجود، عن زِر، قال: خرجت أريد صفوان بن عسال المرادي

لأسأله، فقال: ألا أخبرك بما سمعت من رسول الله ﷺ في طالب العلم قبل أن أحدثك؟

قلت: بلى.

قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول: «إن الملائكة لتخفض - أو لتضع - أجنحتها لطالب العلم سرورا بما يفعل» .

واته: زر وتی: دەرچووم بۆ لای صفوان ی کوڕی عسال ی موورادی تا پرسیاری لێبکەم، ئەویش وتی:

ئایا پێت ڕانەگەیەنم لەوەی بیستوومە لە رسول الله ەوە ﷺ دەربارەی داواکردنی زانست پێش ئەوەی قسەت لەگەڵ بکەم؟

وتم: بەڵێ.

وتی: گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: ﴿فریشتەکان باڵەکانیان نزم دەکەنەوە یاخود ڕادەخەن بۆ داواکاری زانست وەک دڵخۆشبوونێک بەو کارەی ئەو کەسە دەیکات﴾.

٣٠- حدثنا أبو محمد عبد الله بن العباس الطيالسي، نا نصر بن علي، نا خالد بن يزيد، نا أبو جعفر الرازي، عن الربيع بن أنس، عن أنس بن مالك -رضي الله عنه- قال : قال رسول الله ﷺ : من خرج في طلب العلم ؛ فهو في سبيل الله حتى يرجع .

واتە : رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: ﴿هەر کەسێک دەربچێت بۆ داواکردنی زانست، ئەوا ئەو کارەی لە پێناوی پەروەردگارە هەتا ئەگەڕێتەوە﴾.

٣١- نا أبو العباس أحمد بن موسى بن زنجويه القطان، نا هشام بن عمار الدمشقي، نا جعفر بن عمر، عن عثمان بن عطاء، عن أبيه، عن أبي الدرداء رضي الله عنه ، قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول: ما سلك عبد طريقا يقتبس فيه علما إلا سلك به طريقا إلى الجنة ، وإن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم

رضى عنه، وإنه ليستغفر للعالم من في السماء، ومن في الأرض، حتى

الحيتان في البحر، وفضل العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب، وإن العلماء هم ورثة الأنبياء، إن الأنبياء لم يورثوا دينارا ولا درهما، ولكنهم ورثوا العلم، فمن أخذ به فقد أخذ بحظ وافر .

واتە : گوێم لە رسول اللهﷺ بوو دەیفەرموو: ﴿هیچ بەندەیەک نییە ڕێگایەک بگرێتەبەر زانستێکی پێ بەدەستبهێنێت ئیللا بەو کارەی ڕێگایەکی گرتۆتەبەر بەرەو بەهەشت، بەڕاستی فریشتەکان باڵەکانیان ڕادەخەن بۆ  داواکاری زانست بەهۆی ڕازیبوونیان لێی، بەڕاستی هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکانن داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ  زانا و هەرچی ئەوەی لە زەویشە، تەنانەت ماسییەکانی نێو دەریا، فەزڵیکەسی زانا بەسەر کەسی خواپەرست وەک فەزڵی مانگ وایە لە شەوی چواردە  بەسەر تێکڕای ئەستێرەکان، وە بەڕاستی زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، بەڕاستی پێغەمبەران دینارێکیان درهەمێک نەبۆتە میراتیان، بەڵام

زانستیان لەدوای خۆیان جێهێشتووە، بۆیە هەرکەسێک دەستی پێوەبگرێ ئەوا دەستیگرتووە بە پشکێکی زۆرەوە﴾.

٣٢- نا أبو بكر عبد الله بن أبي داود السجستاني، نا أبو الطاهر أحمد بن عمرو بن السرح المصري، نا بشر بن بكر، عن الأوزاعي، عن عبد السلام بن سليم عن يزيد بن سمرة، عن كثير بن قيس، عن أبي الدرداء رضى الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : إنه ليستغفر للعلماء كل شيء حتى الحيتان في جوف البحر، ولفضل

العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب، إن العلماء ورثة الأنبياء، إن الأنبياء لم يورثوا دينارا، ولا درهما، إنما ورثوا العلم، فمن أخذه أخذ بحظ وافر]

واتە : أبو درداء الله لێیڕازی بێت دەگێڕێتەوە، رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿بەڕاستی هەموو شتێک داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ زاناکان تەنانەت ماسییەکانیش لەناو قوڵایی دەریا، وە فەزڵی زانا بەسەر کەسی خواپەرست وەک فەزڵی مانگ وایە لە شەوی چواردە بەسەر تێکڕای ئەستێرەکان، وە بەڕاستی زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، بەڕاستی پێغەمبەران دینارێک، نە درهەمێک نەبۆتە میراتیان، بەڵام زانستیان لەدوای خۆیان جێهێشتووە، بۆیە هەر کەسێک دەستی پێوەبگرێ ئەوا دەستیگرتووە بە پشکێکی زۆرەوە﴾

قال محمد بن الحسين :

٣٣- فإن قال قائل: هذا الفضل كله لكل من طلب العلم؟

قيل له: [هذا الفضل إنما هو لمن حسنت نيته في طلب العلم ].

فإن قال: وما حسن النية فيه ؟

قيل: من خرج ليتعلم من العلم ما ينفي به عنه الجهل بما لله عز وجل عليه من حق عبادته، حتى يعبد الله الكريم بعلم، فطلب من العلم ما ينفعه به في دينه على حسب ما تقدم ذكرنا له، وكلما ورد عليه أمر من أمر الدنيا والآخرة مما قد أشكل عليه ، يريد السلامة منه ، فلم يكن عنده فيه علم - سعي إلى العلماء فيه ليتعلمه لله عز وجل، يطلب بذلك سلامة دينه ، فأي طريق سلك هذا الطالب قصير أو طويل، كان داخلا في معنى ما ذكرناه من الفضل لطلبة العلم، وأعين عليه إن شاء الله.

وأعلم أنه من كان طلبه من العلم ما ينتفع به، فأقل القليل من العلم ينفعه إن شاء الله .

واته : محمدى كوڕى حسين وتى:

ئەگەر قسەكەرێک وتی: ئەم هەموو فەزڵە بۆ هەر كەسێكە داواى زانست بكات؟

پێی دەوترێ: ئەم فەزڵە تەنها بۆ كەسێكە نییەتەكەی باش بێت.

ئەگەر قسەكەرێک وتی: نیەت باشبوون تیایدا چییە؟

پێی دەوترێ: هەر کەسێک دەرچێت بۆ فێربوونی زانست بۆ لابردنی نەزانیی لەو مافانەی کە لەسەریەتی لە بەڕاست پەرستنی الله عَزَّ وَ جَل، تاوەکو الله عزَّ و جل بپەرستێ بە زانستەوە، ئەو زانستە داوادەکاتکە سوود بەدینەکەی دەگەیەنێ بەو شێوەیەی باسمان کرد، هەرکاتێک ڕووبەڕووی کارێک بۆوە کە دوودڵ بوو دەربارەی، دەیەوێت سەلامەت بێت لێی، بەڵام زانستی پێنەبوو بۆیە چوو بۆلای زانایان بۆ ئەوەی لەپێناوی الله عزَّ و جل فێری ببێت و بەوە داوای سەلامەتی دینەکەی بکات، هەر ڕێگەیەک ئەو فێرخوازە گرتبێتییە بەر، کورتبێیان درێژ، دەچێتە ناو ئەو مانایەی لە فەزڵی داواکاری زانست کە باسمانکرد، وە یارمەتیش ئەدرێت لەو کارەیدا إن شاءالله.

وە بشزانە ئەو کەسەی داواکردنی زانستی لەو زانستانە بێکە سوودی پێدەگەیەنێ ئەوا کەمترینی کەمەکان لەو زانستە سوودی پێدەگەیەنێ إن شاءالله، [واتە کاتێک فێرخواز لە داواکردنی زانستدا نیەتی باشبوو و ویستی بەو زانستەی سوود بەخۆی بگەیەنێ بەوەی جەهل لەسەر خۆی لابدات لەوشتانەی کەوا فەرزن و پێویستن لەسەری بیانزانێت، ئەوکات کەمترین زانست کە فێری دەبێ سوودی پێدەگەیەنێ و الله تعالى بەرەکەتی تێدەخات، بە پێچەوانەشەوە کاتێک نیەتی باش نەبوو لە داواکردنی زانستدا و مەبەستی نەبوو زانستەکەی سوودی قیامەتی بۆی هەبێت و لەو زانستانە نەبێ کە فەرزن یاخود پێویستن یاخود خەریکی زانستێکی لاوەکییە لە کاتێکدا زانستە فەرز و پێویستەکەی پشتگوێخستووە لەبەر ناوبانگ و شوهرەت یاخود مەبەستی تری دونیایی، یاخود بەهۆی نەزانینەوە، (پەنادەگرین بە الله تعالى)،ئەو کات هەرچەند علم و زانست گوێ لێبگرێت و بینوسێتەوە و هەرچەند بچێتە کۆڕ و دانیشتگەی زانست و زانایان، سوود لە زانستەکەی وەرناگرێ و بێ بەرەکەت دەبێ و تەنهاڕووکەشە] والله تعالى أعلم.

٣٤- حدثنا أبو القاسم عبد الله بن محمد بن عبد العزيز البغوي، نا علي بن الجعد، نا شعبة، عن عمرو بن مرة، سمعت أبا البختري يحدث، عن رجل من بني عبس،

قال: صحبت سلمان رحمه الله ، فأتي على دجلة ، فقال : يا أخا بني عبس، انزل فاشرب .

قال : فنزلت فشربت .

ثم قال لي: يا أخا بني عبس، انزل فاشرب .

قال : فنزلت فشربت .

فقال: ما نقص شربك من ماء دجلة؟

فقلت : ما عسى أن ينقص.

قال : كذلك العلم، فعليك بما ينفعك .

واته : گوێم له باوكی بختری بوو قسەی دەكرد دەربارەی پیاوێك له بەنی عبس، وتی: هاوڕێیەتی سلیمان م كرد چوو بۆ سەر ڕووباری دیجله، وتی ئەی براكەمان له بني عبس، وەره خوارەوە ئاو بخۆرەوە.

وتی چوومه خوارەوە و ئاوم خواردەوە.

پاشان وتی: ئەی براكەمان له بني عبس، وەره خوارەوە ئاو بخۆرەوە.

وتی چوومه خوارەوە و ئاوم خواردەوە.

پاشان وتی: ئاوخواردنەوەکەت چی کەمکرد لەڕووباری دیجلە؟

وتم: کەم ناکات.

وتی: زانستیش بەهەمان شێوەیە، خەریکی ئەوەبە کە سوودت پێدەگەیەنێ.

٣٥- حدثنا أبو محمد يحيى بن محمد بن صاعد، حدثني الحسين بن الحسن المروزي، نا عبد الله بن المبارك، أنا مسعر، سمعت عمرو بن مرة، يحدث عن

أبي البختري، قال : صحب سلمان رضي الله عنه رجل من بني عبس، قال : فشرب شربة من دجلة .

فقال له سلمان: عد فاشرب .

قال: قد رويت .

قال: أترى شربتك هذه نقصت منها شيئا ؟

قال: وما تنقص منها شربة شربتها !

قال : كذلك العلم لا يفنى فاتبع، - أو قال : فابتغ - من العلم ما ينفعك .

قالمحمدبنالحسين :

فهذا الكلام من سلمان رضى الله عنه يدل على ما تقدم ذكرنا له . . فانتفع قليل العلم عن كثيره .

واته : گوێم له عەمریکوڕی مرة بوو قسەی دەکرد دەربارەی باوکی بختری، پیاوێک هاوڕێیەتی سلیمان یکرد له بەنی عبس، وتی: جارێک ئاوی خواردەوە له ڕووباری دیجله.

سلیمان پێی وت: بگەڕێوە دووباره بخۆرەوە.

وتی: تینوێتیم شکا .

ئەویش وتی : ئایا ئەبینی ئەو ئاو خواردنەوەیەت هیچی کەم کردبێت له دیجله؟

وتی : قومێک ئاو لێم خواردۆتەوە هیچی لێ کەم نەکردووە؟!

وتی : زانستیش بەهەمان شێوه [کەواته شوێنی بکەوە_یا وتویەتی : داوابکە] له زانست ئەوەی سوودت پێدەگەیەنێ .

ابوبکری کوڕی حسین وتی :

ئەم وتەیە له سلمان ەوە ئاماژە دەکات بەوەی باسمانکرد،..... بەشێکی کەمی زانست سوود دەگەیەنێ لەزۆرەکەی .

٣٦- حدثنا أبو جعفر أحمد بن يحيى الحلواني، نا الحكم بن موسى، نا ضمرة ، عن عبد الله بن شوذب، عن مطر الوراق في قوله عز وجل قبل : يقول الله عز وجل في

كتابه العزيز : ( وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ )-١٧-القمر- ، قال: هل من طالب العلم يعان عليه .

واته : مطر الورَّاق دەربارەی ئەم ئايەتە (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ)، وتی: هيچ فێرخوازێکی زانست نيە ئيلا ئاسان دەکرێ لەسەری .

قال محمد بن الحسين :

٣٧- وقال بعض العلماء : أولى العلم بك : ما لا يصلح العمل إلا به .

وأوجب العلم عليك : العمل به .

وأنفع العلم لك: ما دلك على صلاح قلبك وفساده .

وأحمد العلم عاقبة : ما تعجلت نفعه في العاجلة.

فلا تشتغلن بعلم لا يضرك جهله .

ولا تغفلن عن علم يزيد في جهلك بتركه؛ فلرب العلم يريح البدن، ويغزر منه الثواب، ورب علم يتعب البدن، ويكثر منه العقاب.

محمدی کوڕی حسين وتی :

واته : هەندێ لە زانايان دەڵێن :

شايستەترين زانست پێت، ئەو زانستەيە کە کارت ناگونجێ ئيللا بەو نەبێ .

ئەوەی زانستی واجب کردووە،کارکردنە پێی .

بەسوودترین زانست بۆت، ئەوەیە کە ڕێنمونیت دەکات بۆ چاک بوون و تێکچوونەکانی دڵت .

سوپاسکراوترین سەرەنجامی زانست، ئەوەیە کە سوودەکەی لە دونیادا پێشدەخرێ بۆت .

بۆیە سەرقاڵ مەبە بە زانستێک کە نەزانینی زیانت پێناگەیەنێ .

وە بێئاگا مەبە لە زانستێک کە تەنها نەزانییت زیاد دەکات بە وازلێهێنانی، ڕەنگە زانستێک لاشە ئاسوودە بکات و پاداشتی زیادبکات پێی، وە ڕەنگە زانستێک لاشە ماندوو بکات و سزا زیاد بکات .

٣٨- ثم اعلم - رحمك الله - أن من طلاب العلم أناس لهم عقول مؤيدة، وآداب جميلة، وفهوم حسنة، يحبون أن يحبوا سنن رسول اللهﷺ ، وسنن أصحابه رضي الله عنهم، ويميتون البدع، ويحبون جمع العلم وكثرته ؛ ليحفظوا به على المسلمين شريعتهم، كراهية أن يضيع العلم، فإذا بلغهم أن شيخا من الشيوخ في بلد شاسع معه علم، وحفظ للسنن، ومعرفة بها رحلوا إليه؛ رغبة منهم للسماع من مثل ذلك الشيخ؛ إذا كانثقة، مأمونا، صادقا ، عارفا بما يحدث.

فمثل هذا يرغب فيه أهل الحديث؛ ليأخذوا عن مثله العلم ، بنية جميلة، وعقل ومعرفة بالعلم، وبمن يؤخذ عنه ، وبمن لا يؤخذ عنه ، فرحلوا إليه .

فهذه صفة من تضع له الملائكة اجنحتها رضا بما يصنع، وهو ممن هو في سبيل الله حتى يرجع، وممن تستغفر له الملائكة والحيتان في البحر ، وممن قد سلك طريقا إلى الجنة، وممن ينفع الله تعالى به جميع خلقه .

واته : وه بزانه ڕەحمەتی الله ـت لێبێ، له فێرخوازانی زانست كەسانێك هەیانه عەقڵێكی پاڵپشتیكراو، وه خووڕەوشتی جوان و تێگەیشتنی باش، حەز دەكەن سوننەتەكانی رسول الله ﷺ و هاوەڵەكانی زیندوو بكەنەوە، داهێنراوەكان دەمرێنن، حەزیان به كۆبوونەوەی زانست و زۆرییەتی، بۆ ئەوەی شەریعەتی مسوڵمانان بپارێزن بەهۆیەوە، وه بەهۆی ڕق لێبوونیان بۆ ونبوونی زانست، كاتێك پێیان گەیشت شێخێك له وڵاتێكی گەورەدا علمێكی لایه و سوننەتەكانی پاراستووه، پێی بزانن گەشت دەكەن بۆلای، بەهۆی هەبوونی حەزیان بۆ بیستنی ئەمانه له شێخەكان ئەگەر جێی متمانه و إمام بێت، ڕاستگۆ بێت و زانا بێت بەوەی دەیڵێت .

هاوشێوەی ئەوانه اهلی حدیث و فەرموودە حەزدەكەن پێی، بۆ ئەوەی له نمونەی ئەوانه زانست وەرگرن، به نیەتێكی جوان و عەقل و زانیاری هەبوون به زانست،.......

ئەمه سیفەتی ئەو كەسەیه كه فریشتەكان باڵەكانیان بۆ ڕادەخەن بەهۆی ڕازیبوون لەكارەكەی، وه ئەو لەو كەسانەیه كه له پێناو الله ـن هەتا دەگەڕێتەوە، وه لەو كەسانەیه كه فریشتەكان و ماسییەكانی دەریا داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكات، وه لەو كەسانەیه كه ڕێگای گرتۆته بەر بۆ بەهەشت، وه لەو كەسانەیه الله عزَّ و جل هەموو خەڵكی سوودمەند دەكات بەهۆیەوە .

قال محمد بن الحسين :

اعلم - رحمك الله - أن هذا الضرب في الناس قليل جدا، ولن يضرهم ذلك، وهم عند الله كثير ، هذا جواب لمن طلب هذا الفضل كله لكل من طلب العلم .

فأما من كان ممن طلبه العلم المكاثرة، والمفاخرة، والرياء والسمعة، والجدل . . . ممن طلب العلم .

واته : محمدى كورِى حسين وتى :

بزانه ڕەحمەتى اللّٰەت لێبێ، ئەم جۆرە لەناو خەڵكى زۆر كەمن، ئەمەش زیان ناگەیەنێ پێیان و لاى اللّٰه زۆرن [ئەمە وڵامى ئەوكەسەیەكە داواى هەموو ئەو فەزڵە دەكات بۆ هەموو ئەوانەى داواى زانست دەكەن .

ئەمما كەسێك داواكردنى زانست بۆ زۆریی زانستەكەى و لە خۆبایی بوون و ڕیابازیی و ناوبانگ و مناقشەكردن .... لەوانەى داواى زانست دەكەن .

٣٩- حدثنا أبو بكر جعفر بن محمد الفريابي ، نا محمد بن الحسن البلخي، نا عبدالله المبارك، قال: سمعت سفيان الثوري يقول: كان يقال: تعوذوا بالله من فتنة العابد الجاهل، ومن فتنة العالم الفاجر، فإن فتنتهما فتنة لكل مفتون.

واته : گوێم لە سوفیانی ثوری بوو دەیوت: پەنابگرن بە خوا لە خواپەرستێکی نەزان، وە لە فیتنەی زانایەکی خراپەکار، چونکە فیتنەکەی فیتنەیەکە بۆ هەموو کەسێکە کە تووشی فیتنە دەبێت .

**٤٠-** اخبرنا أبو محمد عبد الله بن صالح البخاري، نا الحسن بن علي الحلواني ، نا سعيد بن أبي مريم ، نا يحيى بن أيوب، عن ابن جريج، عن أبي الزبير، عن جابر رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ : «لا تتعلموا العلم لتباهوا به العلماء، ولا لتماروا به السفهاء، ولا لتخيروا به المجالس، فمن فعل ذلك ؛ فالنار فالنار».

قال محمد بن الحسين :

فمن كان مراده في طلب العلم لهذه الأحوال وأشباهها من أمور الدنيا وما ورد منها، ليس لله عز وجل فيها شيء، كيف يلحقه ثواب ما تقدم ذكرنا له من فضل من طلب العلم ؟!

الله المستعان! ما أشد فتنة من طلب العلم، وما أعز من طلبه الله عز وجل ، وما منهما أحد إلا وأخلاقه تدل على صحة طلبه العلم لله عز وجل ، أو على فساد طلبه، أيخفى على أهل العقل والعلم صحة ذا من فساد ذا، أعاذنا الله وإياكم من علم لا ينفع.

واته: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿زانست فێرمەبن بۆ ئەوەی شانازی بکەن بەسەر زاناکانەوە، نە بۆ ئەوەش مناقشەی گەمژەکانی پێبکەن، نە بۆ ئەوەی

مەجلیسەکانی پێ هەڵبژێرن، هەر کەسێک ئەوە بکات، ئاگر جێگایەتی، ئاگر جێگایەتی ﴾.

محمدی کوڕی حسین وتی :

هەر کەسێک لە فێربوونی زانست مەبەستی ئەو بارودۆخ و هاوشێوەکانی بێت لە کاروبارەکانی دونیا و ئەوەی هاتووە دەربارەیان، هیچ شتێکی بۆ الله عزَّ و جل نەبێت، چۆن پاداشتی ئەوەی پێدەگات کە لە پێشووتر باسمانکرد لە فەزڵی داواکردنی زانست؟!

الله هاوکارمان بێت، فیتنەی داواکردنی زانست چەندە قورسە، وە چەندە بەعیزەت و شکۆیە ئەو کەسەی داوای دەکات لە پێناوی الله عزَّ و جل، وە هیچ کەسێک نیە لەوانە ئیللا خووڕەوشتەکەی ئاماژە دەکات بە درووستێتی ئەوەی داوای دەکات لە پێناو الله عزَّ و جل، یاخود خراپیی داواکردنەکەی، ئایا خاوەنەکانی عەقڵ و زانست لێیان دەشاردرێتەوە تێکچوون و خراپی ئەو لە تێکچوون و خراپیی ئەوی تر الله پەنای ئێمە و ئێوەش بدات لە زانستێک کە سوود ناگەیەنێت .

باب (٤)

## ﴿ فضل مجالسة العلماء ﴾

## ﴿فەزڵی دانیشتن لەگەڵ زانایان﴾

٤١ . حدثنا أبو جعفر أحمد بن يحيى الحلواني، نا أحمد بن عبدالله بن يونس، نا أبو بكر بن عياش، عن أبي المهلب، عن عبيد الله بن زحر، عن علي بن يزيد، عن القاسم ، عن أبي أمامة رضي الله عنه ، قال : قال رسول اللهﷺ : «إن لقمان الحكيم قال لابنه : يا بني، عليك بمجالسة العلماء، واسمع كلام الحكماء، إن الله تعالى يحيي القلب الميت بنور الحكمة، كما يحيي الأرض الميتة بوابل المطر ».

واتە : رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی وت : ئەی کوڕەکەم پابەند بە بە دانیشتن لەگەڵ زانایان، و گوێبگرە لە قسەی دانایان، بەڕاستی الله تعالی دڵی مردوو زیندوودەکاتەوە بە ڕووناکیی دانایی، وەک چۆن زەویی دەژیێنێتەوە بە دڵۆپە گەورەکانی باران﴾.

٤٢ - حدثنا أبو محمد يحيى بن صاعد، نا الحسين بن الحسن المروزي، أنا عبد الله بن المبارك، نا عبيد الله بن عمر، عن عبد الوهاب بن بخت المكي ، قال: قال لقمان لابنه: يا بني جالس العلماء وزاحمهم بركبتيك ، فإن الله عز وجل القلوب بنور الحكمة، كما يحيي الارض بوابل السماء .

واته : له عبدالوهاب كوڕى بخت ى مەككى یەوە، وتى: لوقمانى حەكيم به كوڕەكەى وت: ئەى ڕۆڵەكەم، لەگەڵ زاناكان دابنيشە، وە قەرەباڵغييان بۆ دروستبكە بە چۆكەكانت، چونكە بەڕاستى اللَّه عزَّ و جل دڵەكان زيندوو دەكاتەوە بە ڕووناكيى دانايى، وەك چۆن زەويى زيندوودەكاتەوە بە دڵۆپە گەورەكانى باران﴾.

**٤٣-** حدثنا أبو أحمد هارون بن يوسف ثنا أبي عمر العدني - يعني محمدا .. أنا أبو عبد الرحمن [عبد الله بن يزيد المقرئ ] ، نا عبد الرحمن بن زياد بن أنعم، نا عبد الرحمن بن رافع، عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنه، قال : إن رسول الله ﷺ مر بمجلسين في مسجده، أحد المجلسين يدعون الله عز وجل ويرغبون إليه ، والآخر يتعلمون الفقه ويعلمونه، فقال: «كل المجلسين على خير ، وأحدهما أفضل من صاحبه ، أما هؤلاء فيدعون الله عز وجل ويرغبون إليه ، فإن شاء منعهم وأما هولاء فيتعلمون ويعلمون الجاهل، فهم أفضل، وإنما بعثت معلما ثم جلس إليهم»

واته : رسول الله ﷺ تێپەڕی بە دوو مەجليس ى مزگەوتەكەى، یەكێك لە مەجليسەكان بانگ دەكەن بۆ لاى اللَّه عزَّ و جل و حەزى خەڵك زیاد ئەكەن بۆى، وە مەجليسەكەى تر فيقه فێردەبن و فێرى خەڵكى دەكەن، ئەويش فەرمووى: ﴿هەردوو مەجليسەكە لەسەر خێر و چاكەن، بەڵام یەكێكيان فەزڵى زیاترە لە ئەوى تر؛

ئەمما ئەوانە خەڵکی بانگدەکەن بۆ لای اللَّه عَزَّ وَ جَل و حەزی خەڵک زیاد ئەکەن بۆی، ئەگەر ویستی لێبێ بێبەشی دەکردن، ئەمما ئەوانەشی فێردەبن و خەڵکی نەزانیش فێردەکەن، ئەوانە فەزڵیان زیاترە، بەڕاستی من نێردراوم تا ببمە فێرکار، پاشان چووە لایان دانیشت﴾.

**٤٤** - حدثنا ابن صاعد، نا الحسين المروزي، نا ابن المبارك، نا عبد الرحمن بن زياد بن أنعم عن عبد الرحمن بن رافع، عن عبد الله بن عمرو رضي الل عنه قال : دخل رسول اللهﷺ المسجد فرأى مجلسين أحد المجلسين يدعون الله عز وجل ويرغبون إليه، والآخر يتعلمون الفقه .

فقال رسول الله ﷺ: «كل المجلسين على خير، وأحدهما أفضل من صاحبه، أما هؤلاء يتعلمون ويعلمون الجاهل، وإنما بعثت معلما، هولاء أفضل، فجلس معهم» .

واتە : رسول اللّه ﷺ هاتە مزگەوتەوە دوو مەجلیسی بینی یەکێک لە مەجلیسەکان بانگ دەکەن بۆ لای اللَّه عزَّ و جل و حەزی خەڵک زیاد ئەکەن بۆی، مەجلیسەکەی تر فیقه فێردەبن و فێری خەڵکی دەکەن، ئەویش فەرمووی : ﴿هەردوو مەجلیسەکە لەسەر خێر و چاکەن، بەڵام یەکێکیان فەزڵی زیاترە لە ئەوی تر، ئەمما ئەوانە فێردەبن و نەزانیش فێردەکەن، بەڕاستی من نێردراوم تا ببمە فێرکار، ئەمانە فەزڵیان زیاترە، پاشان چووە لایان دانیشت﴾ .

[ ئەزیزانم کاتێ رسول الله ﷺ باس لەوە دەکاتکە مجلیسی فقهە ئەجری زیاترە،

چونكە لە مەجليسى يەكەم كە تيايدا بانگى خەڵك دەكەن واتە بانگى خەڵك دەكەن بۆ نزيك بوون لە الله وە ئەم نزيك بوونەوەش كە لەڕێی عيبادەت و زيكرەكان و سوننەتەكانەوەيە، ياخود باس كردنى پاداشتى وتنى زيكرەكان لە بەرامبەريدا .

بەڵام مەجليسى دووەمكە خەڵكى فێرە فقهە دەكەن و نەزان لە جهلەكەی ڕزگار دەكەن ئەمەيان ئەفزەڵترە.

چونكە خەڵك فێرى تێگەيشتن و شارەزابوونى دين دەكەن، كە لە ئەثەرەكانى پێشووش باسكراوە كەفريودانى كەسێكى فەقيه و شارەزا لەدين لاى شيطان زۆر قورسترە وەك لە كەسێكى عابد و خواپەرست .

بۆيە مەجليسى دووەم ئەفزەڵتر و چاكترە، والله تعالى اعلم ] .

**٤٥ .** حدثنا أبو الفضل جعفر بن محمد الصندلي، نا أحمد بن منصور الرمادي،نا عبد الله بن صالح، حدثني معاوية بن صالح، عن أبي عبيد، عن ابن سيرين، قال : دخلت مسجد البصرة، والأسود بن سريع يقص على الناس ، وقد اجتمع اهل المسجد.

وحلقة من أهل الفقه جلوسا في ناحية أخرى يتحدثون بالفقه ، ويتذاكرون .

قال : فركعت بين المذكر والحلقة، فلما فرغت من السبحة ،

قلت : لو أتيت الأسود فجلست إليه عسى أن تصيبهم إجابة ورحمة ، فتصيبني معهم .

ثم قلت : لو أتيت الحلقة فتفقهت معهم لعلي أسمع معهم كلمة لم أسمعها فأعمل بها، فلم أزل أخير نفسي في ذلك، وأشاورها حتى جاوزتهم، فلم أقعد إلى واحد منهم، فانصرفت، فأتاني آت في المنام، فقال : أنت الذي ركعت بين المذكر والحلقة التي يذكر فيها الفقه ؟

فقلت : نعم

قال : أما إنك لو أتيت الحلقة التي يذكر فيها الفقه لوجدت جبريل معهم جالسا.

واته : گوێم له ابن سيرين بوو دەیوت: چوومە نێو مزگەوتی بەسرە، أسودی کوڕی سریع چیرۆکی دەگێڕایەوە بۆ خەڵک و خەڵکی مزگەوتەکەش کۆببونەوە.

وە بازنەیەکیش لەولاوە لە اهلی فیقهـ دانیشتبوون لە لایەکی تر باسی فقهـ یان دەکرد و پێداچوونەوەیان دەکرد .

وتی: منیش نوێژمکرد لەنێوان ئەوکەسانەی پیاچووەوەیان ئەکرد بۆ فقهـ ەکە و بازنەکە، کاتێ تەواوبووم لە نوێژە سوننەتەکە، وتم: ئەگەر چووبامە لای أسود و دانیشتبام لای بەڵکو وەڵامێک و ڕەحمەتێکیان تووش بووبا و منیش تووشم بووبا لەگەڵ ئەوان.

پاشان وتم : ئەگەر چووبام بۆ لای بازنەکە و لەگەڵ ئەواندا فێری فقهـ بووبام بەڵکو وشەیەکم گوێ لێبووباکە پێشتر گوێم لێنەبووە تاوەکو کاری پێبکەم، هەر خۆم سەرپشک ئەکرد لە نێوان ئەم دووانە و ڕاوێژم پێئەکرد تاوەکو تێمپەڕاندن، لای هیچیەکێکیان دانەنیشتم و ڕۆیشتم، لە خەونمدا

كەسێك هات بۆ لام،پێی وتم : ئەوە تۆ بووی لە نێوان یادکەرەوە و بازنەکەدا نوێژتکردکە باسی فقهـ یان دەکرد؟

وتم: بەڵێ.

وتی: ئەگەر چووبایت بۆ لای ئەو بازنەی باسی فقهـ یان دەکرد، ئەوا جبريل ـت ئەبینی دانیشتووە لەگەڵیان .

**٤٦.** حدثنا أبو الفضل الصندلي - أيضا -، أنا أبو بكر بن زنجويه، نا معاوية بنصالح، نا ابن وهب، أخبرني مسلمة بن علي عن عبد الرحمن بن يزيد، عن ابن شهاب، عن أبي ادريس ، انه سمع ابا الدرداء رضي الله عنه يقول : من فقه الرجل: مجلسه ، ومدخله، ومخرجه مع أهل الفقه.

واتە : گوێم لە أبا درداء بوو دەیوت: بەڕاستی لە فقهـ و تێگەیشتنی پیاوەکەوا، دانیشتگە، هاتنە ژوورەوە و دەرچوونی لەگەڵ اهلی فقهـ بێت.

**٤٧.** اخبرنا الفريابي، نا الوليد بن عتبة الدمشقي، نا عمر بن عبد الواحد، عن الأوزاعي، عن حسن بن الحسن، عن عون بن عبد الله، قال: جلسنا إلى أم

الدرداء رضي الله عنها، فقلنا لها : لعلنا

أمللناك ؟

فقالت: أمللتموني ؟!

لقد طلبت العبادة في كل شيء فما أصبت لنفسي شيئا أشفى من مجالسة العلماء ومذاكرتهم.

واته : له عەونی کوڕی عبدالله وه، وتی: دانیشتین لای أم درداء، پێمان وت: ڕەنگە بێزارمانکردبێ؟

وتی: بێزارتانکردووم؟

له هەموو شتێکدا بەدوای پەرستشدا گەڕام، له هیچ شتێکدا نەمپێکا بۆ نەفسم بەشیفاتربێ له دانیشتن لەگەڵ زانایان و پیاچوونەوەی زانست .

قال محمد بن الحسين :

**٤٨.** فإن قال قائل، فإذا نحن دخلنا مسجد الجامع، فإنا نشاهد فيه خلقا كثيرا قد اجتمعوا، وكلهم يشار إليهم أنهم علماء، فإلى أي الناس تأمرنا أن نجلس إليه منهم؟

قيل له: إن كان لك فهم ومعرفة وحزم، فانظر كل من علمت أنه يعلم المسلمين علما يجب عليهم علمه والعمل به ، ويفقههم به ، ويحثهم فيه على: الطهارة، والصلاة، والزكاة، والصيام، والحج، والجهاد، وعلم الحلال والحرام من المكاسب، وأداء الفرائض، واجتناب المحارم، وعلم بر الوالدين، وصلة الأرحام، وعلم سياسة الرجل لأهله وولده، وعلم حفظ الجوارح، وعلم الأدب في الأكل والشرب، واللباس، وعلم

أدب المؤاخاة، وعلم الشكر الله عز وجل على نعمه، والتحذير من الذنوب ، والترغيب في الأخلاق الشريفة، وما أشبه ذلك فالزمه، واله عما سواه .

واعلم أن هَذا هو العلم الذي أمرت بتعليمه، فاتبع من مجالس العلماء من يجري في مجلسه مثل هذا، مما إذا كان فيه علمت أنك قد استفدت علما أنت إليه فقير .

فاعلم أنك من الله عز وجل عنا ببال إذا وفق لك [محبة] مجالس العلماء . . . الله عز وجل ما عليك من علم كنت عنه . . . عليك منفعة مجالستك مثل هذا العالم، وإن خاصم . . . كرها على استعمال ما قد سمعته من الأخلاق الحميدة [والانتهاء] عن الأخلاق الدنية، واستعن بالله الكريم على جميع أمرك .

واته : گەر قسەكەرێك وتی: گەر ئێمە چووینە مزگەوتەوە، خەڵكێكی زۆر ببینین كۆبوونەوە، وە هەموویان ئاماژەیان پێدەكرێ كە زانان، تۆ بە چ كەسێك فرمانمان پێدەكەی لای دابنیشین لەوان؟

پێی دەوترێ: ئەگەر تێگەیشتن و زانیاری و تۆكمەییت هەبێ، سەیركە كە زانیت هەر كەسێك مسوڵمانان فێری ئەو زانستە دەكات كە پێویستە لەسەریان بیزانن و كاری پێبكەن و تێیاندەگەیەنێت، تێیدا سووریان دەكات لەسەر: پاكوخاوێنی، نوێژ، زەكات، ڕۆژوو، حەج، جیهادكردن، وە زانینی حەڵاڵ و حەرامەكان لە بژێوی پەیاكردن، بەرپاكردنی فەرزەكان، خۆبەدوورگرتن لە حەرامكراوەكان، زانستی چاكەكاری بەرامبەر دایك و باوك، گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وە زانستی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی پیاو بۆ ماڵ و خێزانی، وە زانستی پاراستنی ئەندامەكانی لاشە، زانستی خووڕەوشتەكانی خواردن و

خواردنەوە، وە پۆشاك، زانستی خووڕەوشتەكانی برایەتیكردن، زانستی سوپاسكردنی الله عَزَّ وَجلَّ لەسەر بەخششەكانی، وریایی پێدان دەربارەی تاوانەكان، حەزیان زیاددەكات لەڕەوشتە بەرزەكان، وە هاوشێوەی ئەوان، دووریاندەخاتەوە لە جگە لەو.

بزانەكەوا ئەمە ئەو زانستەیەكە فرمانت پێكراوە فێری ببی، بۆیە لە دانیشتگای زاناكان شوێنی ئەوانە بكەوە كە نمونەی ئەوە بە دانیشتگەكەیان دەڕوات، كاتێ كە تێیدابووی دەزانی كە سوودت وەرگرتووە لەو زانستەیكە هەژاربووی لێی.

بزانە كە وا تۆ لەلای الله عَزَّ وَ جَل گرنگیت پێدراوە ئەگەر خۆشەویستی كرد لات دانیشتگەی زانایان ..... الله عَزَّ وَ جَل لە زانستێك تۆ لێ ..... پێویستە لەسەرت سوود وەرگریت لە دانیشتنەكەت وەك ئەم زانایە، گەر ملاملانێشی كرد ..... وەك بە خراپ دانانێك لە بەكارهێنانی خوڕەوشتە سوپاسكراوانەی كە بیستووتە وە كۆتایی هێنان بە ڕەوشتەكەم و نزمەكان، وە پشت بە الله ببەستە لە سەرجەم كارەكانت.

٤٩ . اخبرنا أبو جعفر أحمد بن يحيى الحلواني، نا عبدالله بن عمر بن أبانالكوفي، نا علي بن هاشم بن البريد، عن مبارك بن حسان، عن عطاء، عن ابن عباس، قال : قيل لرسول الله ﷺ : أي جلسائنا خير ؟

قال :« من ذركم بالله رؤيته، وزاد في علمكم منطقه، وذكركم بالآخرة عمله» .

واته : إبن عباس دەگێڕێتەوە،پرسیارکرا لە رسول الله ﷺ،چ کەسێ لەوانەی کە لەگەڵمان دائەنیشێ باشترینە؟

فەرمووی: (هەرکەسێ الله و بینینەکەی تان بهێنێتەوەیاد، وە بۆ زانستەکەتان ژیری زیادبکات، وە لەباسی دواڕۆژدا کارکردتان بۆی بهێنێتەوە یاد).

**٥٠**-حدثنا أبو بكر محمد بن الحسين البلخي بن شهريار، نا زهير بن محمد المروزي، نا عبيد بن موسى، عن المبارك بن حسان، عن عطاء، عن ابن عباس رضي الله عنهما ، قيل لرسول اللهﷺ : أي لجلسائنا أفضل؟

قال : «من ذكرك بالله رؤيته، وزاد في علمك منطقه ، ورغبك في الآخرة عمله» .

واته: ابن عباس دەگێڕێتەوە،پرسیارکرا لە رسول الله ﷺ،چکەسێ لەوانەیکە لەگەڵمان دائەنیشێ باشترینە؟

فەرمووی: (هەرکەسێ الله و بینینەکەی تان بهێنێتەوەیاد، وە بۆ زانستەکەتان ژیری زیاد بکات، و بۆ دواڕۆژت حەزیکارکردنت بۆی زیاد بکات).

قال محمد بن الحسين :

هذا يحتمل في مجالسته العلماء أن يكون يطلب من المجالس من هذه صفته .

ويحتمل أن لا تجالس من الأصحاب والإخوان إلا من تستفيد منه خيرا في دينك، فإذا لم تكن كذلك فإياك وإياه، بل ينبغي لک ان تحذره .

وقد روى فيما قلته أخبار تدل على العاقل الحازم أن لا يجالس من الناس إلا من تعود عليه منفعته، ممن يرغبه في العلم، والأدب، والأخلاقي الشريفة، وينهاه عن الأخلاق الدنية .

واته : محمدی کوڕی حسین وتی:

ئەمە دەتوانێ لە دانیشتنی لەگەڵ زانایان بەدوای ئەو دانیتشگایانەدا بگەڕێ کە ئەمە سیفەتیەتی.

وە گونجاوە دانەنیشی لەگەڵ هاوڕێیان و برایان ئیللا ئەو کەسە نەبێ کە سوودی خێرێکی لێ ئەبینی لە دینەکەتدا، ئەگەر وانەبوویت وریای خۆت بە و وریای ئەویش بە، بەڵکو پێویستە لەسەرت ئاگاداری بیت.

گێڕدراوەتەوە لەوانەی باسمکردن چەند هەواڵێک ئاماژە دەکات بەوەی کەوا کەسی عاقل و خاوەنکارامەیی دانەنیشێت لەگەڵ خەڵکی ئیللا ئەوانەی سوودی بۆی دەگەڕێتەوە، لەوانەی وای لێئەکەن حەزبکات بە زانست و ڕەوشت و أخلاقە خانەدانەکان، وڕێگری لێدەکات لە ڕەوشتەکەم و نزمەکان.

٥١ـ حدثنا أبو بكر عبد الله بن محمد بن عبد الحميد الواسطي، نا هارون بن عبد الله الحمال، نا سيار بن حاتم، نا جعفر بن سليمان، سمعت مالك بن دينار يقول

لختنه المغيرة : انظر يا مغيرة، كل أخ ، وجليس، وصاحب ، لا تستفيد منه خيرا؛ فانبذ عنك صحبته .

واته : گوێم له مالک ی کوڕی دینار بوو به مغیرةی ئەوت: سەیرکە ئەی مغیرة، هەر برایەک، یان هەرکەسێک لەگەڵی دائەنیشیت، یان هاوڕێیەک، سوودی چاکەی لێ وەرناگری، تۆش هاوڕێیەتیەکەتی لەگەڵ هەڵوەشێنەوە.

**٥٢.** حدثنا أبو خبيب العباس بن أحمد بن البرتي ، نا محمد بن ميمون الخياط، ناسفيان بن عيينة، نا بريد بن عبد الله بن أبي بردة، عن جده، عن أبي موسى يبلغ به النبي ﷺ قال: «مثل الجليس الصالح مثل : العطار، [إن لم يحذك من عطري علق بك] من ريحه .

ومثل الجليس السوء، مثل: الكبر، إن لم يحرقك، نالك من ريحه» .

واته : رسول الله ﷺ فەرموویەتی: ﴿نمونەی هاومەجلیسێک کە چاکەکار بێ وەک نمونەی بۆن فرۆشێکە، [ئەگەر بۆنەکەیشت پیانەکات پێتەوە ئەنوسێ [لە بۆنەکەی].

نموونەی هاومەجلیسێک خراپەکاربێ، وەک نمونەی فووکارە بەکوورەدا، ئەگەر نەشتسوتێنێ، لە بۆنە پیسەکەی هەڵدەمژیت.

**٥٣.** وروي عن شعيب بن حرب أنه قال : لا تجلس إلا مع أحد رجلين : رجلي جلست معه يعلمك خيرا؛ فتقبل منه .

أو رجل : تعلمه خيرا؛ فيقب منك.

والثالث : اهرب منه.

واته : له شعيب بن حرب گێڕڕاوەتەوە کەوا وتویەتی: دامەنیشە ئیلا لەگەڵ یەکێک لەم دوو پیاوە، پیاوێکیان لەگەڵی دانیشتیت فێری چاکەی کردیت و تۆش لێی قبوڵ دەکەیت.

یاخود پیاوێک فێری چاکەی دەکەیت ئەویش لێت قبوڵدەکات.

سێیەمیشیان لێی ڕاکە.

**٥٤.** حدثنا أبو أحمد هارون بن يوسف، نا محمد بن أبي عمر العدني، نا سفيان،عن داود بن شابور، سمع شهر بن حوشب يقول: قال لقمان لابنه: يا بني ، إذا رأيت قوما يذكرون الله عز وجل فاجلس معهم؛ فإنك إن تكن عالما ينفعك علمك، وإن تكن جاهلا يعلموك، ولعل الله عز وجل قبل أن يطلع عليهم برحمة فيصيبك معهم .وإذا رأيت قوما لا يذكرون الله عز وجل فلا تجلس معهم؛ فإنك إن تكن عالما لم ينفعك علمك، وإن تكن جاهلا يزيدوك عيا، ولعل الله عز وجل أن يطلع عليهم بسخطه فيصيبك معهم .

واتە : لوقمان بە کوڕەکەی وت: ئەی ڕۆڵەکەم گەر کۆمەڵە کەسانێکت بینییادی الله عَزَّ وَ جَل یانکرد تۆش لەگەڵیان دابنیشە، چونکە ئەگەر تۆ زانا بیت زانستەکەت سوودت پێ دەگەنێت، وە ئەگەر نەزانیش بوویت فێرت دەکەن و ڕەنگە الله عَزَّ وَ جَل مەبەستی ڕەحمەتێکی خۆی هەبێ بۆیان ئەوا تۆش بەرت ئەکەوێت لەگەڵ ئەوان .

وە ئەگەر کۆمەڵەکەسانێکت بینی یادی الله عَزَّ وَ جَل یان نەدەکرد لەگەڵیان دامەنیشە، چونکە ئەگەر تۆ زانا بیت زانستەکەت سوودت پێ ناگەنێت، وە ئەگەر نەزانیش بیت تەنها بێئاگایی ـت زیاد ئەکەن، وە ڕەنگە الله عَزَّ وَ جَل مەبەستی تووڕەبوونی هەبێ لەسەریان ئەو کات تۆشبەرت ئەکەوێت لەگەڵ ئەوان.

قال محمد بن الحسين :

جميع ما ذكرت في هذا الكتاب يدل على أنه لا ينبغي أن تجالس إلا من يعود نفعه عليك ممن إذا فارقته أراك فهما وعلما وأدبا، وإلا فانبذ عنك مجالسته ، واحذره على دينك .

واتە : محمدی کوڕی حسین وتی:

هەموو ئەوانەی باسمکرد لەو کتێبەدا ئاماژە دەکەن بەوەی نابێ دابنیشیت تەنها لەگەڵ ئەو کەسە نەبێ کە سوودیت بۆ دەگەڕێتەوە لەوانەی کاتێک

لێیان جیابوویەوە تێگەیشتن و زانست و ئەدەبی خۆیت نیشان دەدەن،گەر وانەبوو دانیشتنەکەتی لەگەڵ هەڵوەشێنە، وە لێی بترسە لە دینەکەت.

باب (٥)

## ﴿ ذكر تواضع العالم والمتعلم ﴾

## ﴿ باسێک لە خۆبەکەمزانینی زانا و فێرخواز ﴾

قال محمد بن الحسين :

**٥٥-** واعلم - رحمك الله - أن الذي يحتاج إليه العالم والمتعلم مما ينبغي لهما أن يتمسكا به لانتفاع بما تقدم ذكرنا له : هو التواضع .

فمن صفة تواضع المتعلم للعلم :

• أن لا يأنف أن يتعلم العلم من صغير أو كبير، وممن هو دونه في منزلة الدنيا ، وأن يقبله منه قبولا حسا.

• ويشكر الله عز وجل على ما علمه .

•ثم ليشكر من علمه من سائر الناس .

• ومن التواضع : أن تكون إذا سمعت علما لم يكن عندك فلا تدعي أنك قد كنت تعلمه، فيزهد فيك من علمك؛ ولكن تواضع له ، وأخبره أنك لم تعلمه حتى علمتني أنت الساعة .

واعلم أن من التواضع : سؤالك عما يعنيك مما أنت به جاهل، [وقد] يلعب بك الشيطان فيقول: سؤالك عن مثل هذا يضع منك، ويقال : مثلك [لم يصل علمه] إلى

الساعة ! فيريك أنه لك ناصح، غاش لك فلا تطعه فتهلك، واسأل العلماء عما أنت به جاهل فيزيدك الله الكريم به رفعة عنده، وعند من عقل عن الله عز وجل .

• واعلم - رحمك الله - أن الذي يمنع كثيرا من الناس عن التواضع في المسألة للعلماء عما قد جهلوه مما هو واجب عليهم علمه والعمل به خصلتان.

- الحياة

- والكبر

هما التي قد منعت كثيرا من الناس عن طلب العلم، وما هذا لهم بمحمود.

وذلك أنه ما ذكرنا عن السؤال لما يجب عليهم، فقد رضوا لأنفسهم بالإقامة على الجهل .

فلما رموا التواضع في طلب العلم الواجب؛ أحرموا التوفيق .

واته : محمديكوڕی حسین وتی:

بزانه الله ڕەحمت پێبكات، ئەوەی زانا و فێرخواز پێویستیانه لەوەی كه پێویسته دەستی پێوەبگرن بۆ سوودوەرگرتن لەوانەی پێشتر باسمانكرد: بریتییه له خۆ بەكەمزانیی.

له سیفاتەكانی خۆبەكەمزانیی فێرخواز بۆ زانست:

-نابێرڕقی لەوەبێت كه زانست فێرببێت له بچووك و گەوره، وه لەو كەسانەش كه پێگەیان لەخوارووی خۆیەتی له دونیا، وه به قبوڵكردنێكی جوان قبوڵی بكات.

-وە شوکری الله عَزَّ وَ جَل بکات لەسەرئەوەی فێریکردووە.

-پاشان سوپاسی هەموو ئەوانە بکات کە فێریکردوون لە تێکڕای خەڵکی.

-وە لە خۆبەکەمزانینە: کاتێک گوێبیستی زانستێک بوویتکە لات نیە، بانگەشەی ئەوە نەکەیت کەوا پێشتر زانیوتە، تاوەکو ئەو کەسەی فێرت دەکات وازنەهێنێت،بەڵام خۆبەکەمزان بە بۆی و هەواڵی پێبدە کەوا من پێشتر نەمزانیوە تا ئەو ساتەی فێرت کردم.

- وە بزانە لە خۆبەکەمزانیی ئەوەیە کەوا پرسیاربکەی لەو شتەی کە پەیوەندی بە تۆوە هەیە لەوانەی کە نەزانیت پێی، وە [ڕەنگە] شیطان یاریت پێبکات و بڵێ: پرسیارکردنت لەم جۆرە شتانە لە بەهات کەمدەکاتەوە، وە دەوترێ هاوشێوەی تۆ [زانستەکەی تا ئەم ساتە] نەگەیشتووە! بۆیە وا نیشان دەدات کەوا ئامۆژگاریکارە بۆت بەڵام لەڕاستیدا فێڵکارە بۆیە تۆش گوێڕایەڵی مەکە سەرەنجام تیابچیت، پرسیاربکە لە زانایان لەوشتانەیکە نەزانیت پێیان و الله عَزَّ وَ جَل بەهۆی ئەوەوە بەرزیت زیاد بکات لای خۆی، و لای ئەوانەش کە عاقل بوون دەربارەی الله عَزَّ وَ جَل.

- وە بزانە اللهڕەحمت پێبکات، ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی بەهۆیەوە پشت هەڵدەکەن لە خۆبەکەمزانین لە پرسیارکردنیان لە زانایان لەوانەی کەوا نەزانن پێی لەو شتانەی کە واجبە لەسەریان زانست هەبوون پێیان و کارکردن پێی،بەهۆی دوو سیفەتەوەیە :

- شەرمکردن.

- خۆبەگەورەزانین.

ئەم دووانەن ڕێگریان کردووە لە زۆرینەی خەڵکی لە داواکردنی زانست، ئەمەش سوپاسکراو نییە بۆیان.

چونکە ڕێگریی لێکردوون لەوانەی باسمانکردن لە پرسیارکردن لەو شتانەی واجبن لەسەریان، ڕازیبوون بۆ نەفسی خۆیان بە مانەوە لەسەر نەزانیی.

بۆیە کاتێک بێبەش کران لە خۆبەکەمزانی لە داواکردنی واجبی زانست، بێبەشکران لە سەرکەوتن.

**٥٦-** وروي عن مجاهد أنه قال: لا يتعلم مستحي، ولا مستكبر.

واتە : گێڕڕاوەتەوە لە مجاهد وتویەتی: فێرنابێت کەسێک شەرم بکات، و کەسێک خۆبەگەورەزان بێت.

**٥٧-** وكذا روي عن سفيان بن عيينة .

• واعلم أنك إذا تواضعت للعلماء : أحبوك وأفادوك .

وإذا تعاظمت عليهم وتكبرت، وأريتهم أنك مستغن عنهم : مقتوك، و كرهوا أن يفيدوك .

واتە : بەهەمان شێوە گێڕڕاوەتەوە لە سوفیانیکوڕی عیینة.

- وه بزانه ئەگەر خۆبەکەمزان بوويت بەرامبەر زانايان، ئەوانيش خۆشيان دەوێيت و سوودت پێدەگەيەنن.

وه ئەگەر خۆت گەورەکرد لەسەريان و لوتبەرزبوويت، وه وانيشانتدان کە بێ پێويستيت لێيان، ئەوکات تووڕەدەبن لێت و ڕقيان دەبێتەوە لەوەی سوودت پێبگەيەنن.

قال محمد بن الحسين :

٥٨- أما خطابي لمن يعلم الناس العلم، فينبغي له :

- أن يشكر الله عز وجل .
- ويتواضع لمولاه الكريم .
- ويعلم أنه قد خصه بخاصة خير أو علمه علما حرمه غيره .
- وجعله ورثة من ورثة الأنبياء ، ولم يجعله جاهلا بما لله عز وجل عليه.

* وإن كثيرا من الناس قد احتاجوا إلى علمه :

- فحكمه أن يتواضع لمن يتعلم منه العلم، ويرفق به، ولا يحتقر من يتعلم منه ، ويعلمه : إني مثلك كن جاهلا حتى علمني الله عز وجل فيقرب على المتعلم ما يخاف بعده .

فمن فعل ذلك ؛ أحبه الله عز وجل ، وحببه إلى عباده، ورفع قدره، ونوه

باسمه، وكان بحسن تواضعه ؛ رفيع عند الله عز وجل ، وعند من عقل.

وأنا أذكر من الأخبار ما يدل على ما حثثت الجميع عليه -إن شاء الله تعالى-.

واته : محمد بن الحسين وتى :

ئەمما وتاری من بۆ ئەو کەسەی خەڵکی فێری زانست دەکات پێی ڕادەگەیەنم کە پێویستە لەسەری :

.کەوا سوپاسی الله عَزَّ وَجلَّ بکات .

.وە خۆبەکەمزان بێ بۆ گەورە و بەخشندەکەی .

. وە بزانێتکە ئەو تایبەتکراوە بە تایبەتمەندیەکی چاکەیان فێرکراوە بە علمێک کە جگە لە ئەو لێی بێ بەشن .

. وەکردوویەتی بە میراتگرێک لە میراتگرەکانی پێغەمبەران، وە نەزانی نەکردووە بەوەی لەسەریەتی بەرامبەر الله عَزَّ وَجلَّ.

* وە بەڕاستی زۆربەی خەڵکی پێویستیان بەو علمەی ئەوە :

. بۆیە حوکمی ئەوەکەسە ئەوەیە پێویستە کەوا خۆبەکەمزان بێ بۆ ئەو کەسەی کە علمی لێوە فێردەبێت، وە نەرم و نیان بێت بۆی، سوکایەتی بەو کەسە نەکات کە لێوەی فێردەبێت، وە فێری دەکات [ واتە پێی دەڵێ ] : منیش وەک ئێوە نەزان بووم تاوەکو الله عَزَّ وَجلَّ فێریکردم، بەوە خۆی لە فێرخوازەکە نزیککردەوە، لەدوای ئەوە ناترسێت.

